# پێشەکی

## فێرگەی سەلەفی ئوممەت : ئاستی یەکەم

**ئەم قۆناغە تایبەت ئەبێت بەو کەسانەی کە شارەزاییەکەی ئەوتۆیان دەربارەی ئیسلام و سوننەت نییە، هەربۆیە ڕۆژانە بە خوێندنەوەی یەک یان زیاتر لە یەک پۆست ئاشنا ئەبن بە واتای تەوحید، لا إله إلا الله، ئیسلام، ئیمان، سوننەت، کوفر، شیرک، طاغوت، نیفاق و بیدعە . . . بابەتە سەرەتاییەکانی تر، دوای تەواوکردنی ئەم قۆناغە بەشداربووان ئەچنە قۆناغی دووەم إن شاء الله، ماوەی ئەم قۆناغە دوو مانگ ئەبێت إن شاء الله تعالى .**

**شێوازی فێربوون : ڕۆژانە خوێندنەوەی یەک یان زیاتر لە یەک پۆست لەو بابەتانی کە لە سەرەوە باسکراوە .**

**بۆ بەشداری کردن بڕۆنە ناو ئەو کەناڵەوە، وە ئەگەر حەز ئەکەن لینکی کەناڵەکە بنێرن هەر کەسێک کە شارەزای تەوحید و ئیسلام و سوننەت نییە، بارک الله فیکم .**

https://t.me/FergaySU10

## ئايا مرۆڤ لە پێناو چیدا دروستکراوە؟

**سەرەتا بەم پرسیارە دەست پێ دەکەین، ئایا قەت ویستوتە وەڵامی ئەم پرسیارە بزانیت؟**

وەڵامەکەی ئەوەیە تۆ لە پێناو ئەوەدا دروستکراویت کە بە تەنها الله تعالی بپەرستی و بەندایەتی بۆ بکەیت، هەر وەکو الله عز وجل دەفەرموویت:

(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) (الذاريات :٥٦)

واتە : من جنۆکە و مرۆڤەکانم تەنها بۆ پەرستنی خۆم نەبێت بۆ هیچ شتێکی تر دروستم نەکردوون.

ئەمە بریتییە لەو ئامانجەی کە لە پێناویدا دروست کراویت، ئایا دەکرێت تۆ ئەو شتە لەبیر بکەی کە لە پێناویدا دروست کراویت؟ ئایا دەکرێت نەزان و جاهیل بیت بەرامبەر مەبەست و ئامانجی ژیانت؟

وەرن با بزانین الله چی دەفەرموویت لە بارەی ئەوانەی کە ئەم ئامانجە لەبیر دەکەن :

(كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ ) (طه : ١٢٦)

واتە : هەر بەو شێوەیەی تۆ کە ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەت پێگەیشت و لەبیرت کرد، ئەمڕۆش ئێمە تۆ لە بیر دەکەین (واتە هەتاهەتایە لە جەهەننەم دەتهێڵینەوە و بەو شێوەیە وازت لێ دەهێنین. )

ئایا هەرگیز هەوڵت داوە لە ئایەتەکانی الله عز وجل تێبگەیت؟ ئەسڵەن دەزانیت الله تعالی داوای چی لەتۆ کردووە؟ ئەگەر نازانی، بۆ نازانی؟ دەستپێکە رحمک الله .

ئەم دوو ئایەتە بەسە بۆ ئەوەی لە حەقیقەتی ئەم مەسەلەیە تێ بگەین ئەگەر نا بەڵگەی زیاتر هەیە لەم بارەیەوە لە قورئان و فەرموودەدا.

پۆستی : (١)

## ئایا دینی پێغەمبەران علیهم السلام چ دینێک بووە؟

هەموو پێغەمبەران بە پێغەمبەر محمد یشەوە علیهم الصلاة و السلام؛ یەک دینیان هەبووە، ڕاستە شەریعەتی دینەکانیان جیاوازی تێدا هەبووە بەڵام الله هەموویانی لە پێناو تاکە مەبەست و ئامانجێک ناردووە کە ئەویش بریتییە لە تەوحید واتە یەکخواپەرستی ، تەوحید بریتیە لەوەی کە الله تعالی بە تاک ڕابگریت لەو شتانەی کە تایبەتە بە خۆی.

پێغەمبەرانیش علیهم السلام بۆ ئەوە نێردراون کە بە خەڵکی ڕابگەیەنن ئێوە تەنیا یەک خواتان هەیە کە بە حەق شایستەی پەرستن بێت، دەی کەواتە هەر ئەو بپەرستن، هەر وەکو الله عز وجل دەفەرموویت :

(وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إلاَّ نوحي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إله إلاَّ أَنَا فاعبدون) (الأنبياء( ٢٥)

واتە : ئەی محمد ﷺ هەر پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆوە ناردبێت، وەحیمان بۆ کردووە کە هیچ خوایەک نییە بە حەق جگە لە خۆم - واتە الله - دە کەواتە هەر من بپەرستن.

بەڵگە زۆر هەیە بەڵام ئەم ئایەتە بەسە، کەواتە ڕەحمەتت لێبێ بزانە کە دینی هەموو پێغەمبەران هەمان شت بووە لە ئەساسدا، دەی باشە ئەگەر تەوحید ئەو هەموو پێغەمبەرەی لە پێناودا ڕەوانە کرابێت ئایا شتێکی گرنگ نییە؟ دەکرێت ئیهمال بیت بەرامبەری و فێری نەبیت؟

تۆ ئەگەر نەزان بیت بەرامبەر تەوحید مانای وایە نازانیت دینی پێغەمبەران چی بووە، جا ئەگەر لە شتێک نەزانیت چۆن ئەتوانی بڵێی من ئەهلی ئەو شتەم؟ تۆ ئەگەر نەزانیت مانای تەوحید و سوننەت چییە چۆن ئەتوانیت بڵێیت من موسوڵمانم یان من ئەهلی سوننەم؟ تێبگە ڕەحمەتت لێبێت چونکە ئەمە پەیوەندی بە عاقیبەتی تۆوە هەیە لە قیامەت، ئەگەر تەوحیدت نەبێ تیادەچی وە ئەگەر هەتبێ بشچیتە جەهەننەمەوە هەر دێیتە دەرەوە، ئەوجا ڕەحمەتت لێبێ تەوحید فێربە.

#پۆستی : (٢)

## وەڵامی پرسیارەکان

ئێمە لە پۆستی دووەمدا باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەموویان بۆ یەک ئامانج هاتوون، وە دینی هەموویان ئیسلام ـە، بەڵام شەریعەتەکانیان جیاوازە، ئەمە واتای چی؟

( -دینی هەموویان ئیسلام ـە) واتە : هەموویان بۆ ئەوە نێردراون تا بە خەڵکی بڵێن کە تەنها الله عز وجل شایەنی پەرستنە کە لەسەر عەرشە لەسەرو حەوت تەبەقی ئاسمان، جا هەموو جۆرەکانی پەرستنتان با تەنها بۆ الله تعالی بێت.

(شەریعەتەکانیان جیاوازە) واتە : بۆ نمونە لە شەریعەتی رسول الله (محمد ﷺ) نوێژە فەرزەکان ٥ نوێژە، بەڵام لەوانەیە لە شەریعەتی پێغەمبەرێکی تر ﷺ نوێژە فەرزەکان ١٠ نوێژ بووبێت، بۆ نمونە لە شەریعەتی رسول الله (محمد ﷺ) ڕۆژووە فەرزەکان یەک مانگە، بەڵام لەوانەیە لە دینی پێغەمبەرێکی تر ﷺ ڕۆژووی فەرز دوو مانگ یان نیو مانگ بووبێت، ئیتر الله عز وجل هەرشتێک ویستی لێبێت بەو شێوازەی کە خۆی ئەیەوێت لەسەر بەندەکانی فەرزی ئەکات.

وەڵامی_پرسیارەکان : (١)

## تەوحیدی ڕاستەقینە کامەیە؟ (١)

ئایا تەوحید هەر ئەوەندەیە کە بڕوات وابێت تەنها الله بوونی هەیە و هەر خۆی کاروباری ئاسمانەکان و زەوی بە دەستە و تەواو؟ زۆربەی خەڵکی تەنیا ئەوەندە لەسەر تەوحید زانیاریان هەیە، بەس ئایا لەڕاستیدا هەر ئەوەندەیە؟! ئەگەر بێین وردبینەوە لە چەند ئایەتێک بۆمان دەردەکەوێت کافرانی سەردەمانی پێشووش ئەوەیان زانیوە و لەگەڵ ئەوەشدا الله تعالی یان پەرستووە و بڕوایان وابووە هەر الله رزقیان دەدا ،وە تەنانەت لە دەریادا کاتێک تووشی تۆفان دەبوون بەس داوای یارمەتییان لە الله عز وجل دەکرد!

ئەی بۆچی کافر بوونە لە کاتێکدا ئەم شتانەشیان هەبووە؟

وەلامەکەی ئەوەیە کە ئەوان لەگەڵ الله تعالی دا کەسی دیکەیان دەپەرست، دەیانوت بۆیە ئەمانە دەپەرستین چونکە ئەمانە لای الله عز وجل تکامان بۆ دەکەن یان لە الله نزیکمان دەکەنەوە! بەڵگەی قسەکانیشمان ئەم چەند ئایەتەیە:

اللّٰہ تعالی دەفەرموویت : ( قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ )

(یونس : ۳۱)

واتە : بڵێ ئایا کێ ڕزق و ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمان و لە زەوی؟ یان کێ خاوەنی بینین و بیستنەکانە؟ وە کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێ وە مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت؟ هەروەها کێ کارەکان هەڵدەسوڕێنێت؟ بێگومان یەکسەر دەڵێن الله; کەواتە پێیان بڵێ دەی بۆ لە اللّٰہ ناترسن و شەریکی بۆ دائەنێن؟

یاخود دەفەرموویت : (فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ )(العنکبوت : ٦٥)

واتە : ئینجا کاتێ ئەو (بێ باوەڕانە) سواری کەشتی دەبوون تەنها هاواریان لە الله دەکرد بە ئیخلاص و دڵسۆزی و گەردن کەچییەوە ; کەچی کاتێک دەگەیشتنە وشکانی یەکسەر ئەوان هاوبەشیان بۆ اللّٰہ دادەنا.

دەفەرموویت : (مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ (الزمر : ۳)

واتە : تەنها لەبەر ئەوە دەیان پەرستین تا نزیکمان بکەنەوە لە الله!

ئەوجا تێبگە ڕەحمەتت لێبێت، ئەوان لەبەر ئەوەی تەوحیدیان نەبوو بە کافر لە قەڵەم دران خۆ دیارە لەم ئایەتانە و چەندین ئایەتی تریش کە اللّٰہ یان پەرستووە بەڵام بەبێ تەوحید، واتە شیرکیان ئەنجام داوە; جا ڕەحمەتت لێبێت غافڵ دامەنیشە و تەوحید فێر بە.

لە پۆستی داهاتوودا ڕوونتری دەکەینەوە ان شاء الله

#پۆستی : (۳)

## تەوحیدی ڕاستەقینە کامەیە؟ (۲)

تەوحید خۆی بە مانای بە تاک ڕاگرتنی الله عز وجل دێت، ئەو بە تاک ڕاگرتنەش دەکرێت بەم ۳ بەشەوە:

تەوحیدی ڕبوبیەت (پەروەردگارێتی) : بریتییە لەوەی الله عز وجل بە تاک و تەنها ڕابگری لەوەی کە تەنها خۆی دروستکەر و بەڕێوەبەر و مرێنەر و ژیێنەر و ڕزق و ڕۆزیدەرە . . . هتد.

تەوحیدی ئولوهیەت (پەرستراوێتی) : بریتییە لەوەی الله عز وجل بە تاک و تەنها ڕابگریت لە هەموو پەرستشەکانت و تەنها ئەو بپەرستیت و تەواوی جۆری پەرستنەکان بۆ ئەو تەرخان بکەیت (إن شاء الله تعالی لە پۆستێکدا باسی چەند جۆرێکی پەرستن دەکەین.)

تەوحیدی ئەسماء و سیفات : بریتییە لەوەی الله عز وجل بە تاک رابگریت لەوەی کە تەنها خۆی خاوەنی ناو و سیفاتی جوان و کامڵ و بەرز و بڵندە، وە نابێت ناو و سیفاتەکانی یەک بخەیت یان بە عەقڵ و بۆچوونی خۆت لێکیان بدەیتەوە یان بیچوێنی بە دروستکراوەکانی، ئەوەی لەسەرتە بریتیە لەوەی وەکو خۆی قبوڵی بکەیت و هیچی تر.

بەڵگە لەسەر ئەو سێ بەشەی مە باسمان مرد بریتییە لە فەرمایشتی الله عز وجل : ( رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ) (مریم : ٦٥)

واتە : پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە، ئاگاداری تەواوی بوونەوەرە و هەر ئەویشە دەیانبا بەڕێوە (تەوحیدی ربوبیەت)، کەواتە تۆش بەردەوام هەر ئەو بپەرستە وە بەرامبەر بە ئەرکەکانی پەرستنی ئەو زۆر خۆڕاگر بە (تەوحیدی ئولوهیەت)، ئاخۆ ئاگات لێیە هاو ناوێکی هەبێت؟ دیارە چاک دەزانیت، کە بێ وێنەو بێ هاوبەشە (تەوحیدی ئەسماء و سیفات.)

ئەوجا ڕەحمەتت لێبێت پێویستە لەسەرت ئەگەر خۆت بە موسڵمان دەزانت دەبێت هەر سێ بەشەکەی تەوحید لە خۆتدا جێ بەجێ کردبێت، ناکرێت یەکێکیانت هەبێت و ئەوی ترت نەبێت، چونکە وەکو کافرانی سەردەمانی پێشووت لێ دێتەوە کە بەشێک تەوحیدی ڕبوبیەتیان هەبوو بەڵام ئولوهیەتیان نەبوو.

#پۆستی : (٤)

## ئایا هیچ کار و کردەوەیەک بەبێ تەوحید قبووڵە؟

با بەم پرسیارە دەست پێ بکەین؛ ئایا نوێژ بەبێ دەستنوێژ قبووڵە؟

نەخێر بێگومان، بۆ ئەوەی الله تعالى نوێژەکەت لێ قبووڵ بکات دەبێت دەستنوێژت هەبێت.

بۆ تەوحید یش بە هەمان شێوەیە، ئەگەر تەوحیدت نەبێت ئەوا نوێژ و ڕۆژوو سوودی بۆت نییە، الله تعالى هیچ عیبادەتێک بەبێ تەوحید لێ وەرناگرێت.

کافرانی سەردەمانی پێشووش عیبادەتیان هەبووە بۆ الله تعالى بەڵام بە بێ تەوحید عیبادەتیان کردووە، بۆیە الله تعالى لێی وەرنەگرتوون، ئەگەر بێین لەم ئایەتە وردبیینەوە ئەوە دەزانین کە ئەوانیش عیبادەتیان هەبووە بۆ الله تعالى :

(أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ) (التوبة : ١٩)

واتە : ئایا پێتان وایە ئاودان بە حاجییان و ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەڕام - واتە کەعبەی پیرۆز - وەکو ئەوە وایە کەسێک کە باوەڕی هێنا بێت بە الله و بە ڕۆژی دوایی و جیهادی کردبێت لە ڕێی الله دا؟ یەکسان نین بەلای الله وە، وە الله ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات.

بەڵگەی تریش زۆر هەیە لە قورئان و سوننەت و ژیانامەی پێغەمبەر ﷺ، یەکێک لەوانە ئەو بەسەرهاتەیە کە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ بێت کەعبەی پیرۆز بەشێکی ڕووخاوە و قورەیش

نۆژەنی دەکەنەوە!! هەروەها شەڕیانە لەسەر ئەوەی کێ بەردە ڕەشەکە بکاتەوە شوێنی خۆی!! هەتا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ دێت و پێیان دەڵێت هەر یەکەو لایەکی بگرن و بیکەنەوە شوێنی خۆی؛ دڵنیام هەمووتان ئەم بەسەرهاتەتان بیستووە.

دەی من دەپرسم ئایا ئەمە عیبادەت نییە بۆ الله؟ دەی باشە الله ئەو کارەی لێیان وەرگرت؟ بێگومان نەخێر؛ بۆیە ڕەحمەتت لێبێ نەکەی تەوحید پشتگوێ بخەیت و وابزانیت تەنها بە نوێژ و ڕۆژوو نەجاتت دەبێت.

#پۆستی : (٥)

## الله تعالى چ دینێک قبوڵ دەکات؟

لەوانەیە کەم تا زۆر گوێتان لێبووبێت کەسی وا هەیە دەڵێت من تەنیا الله دەپەرستم پێویست ناکا بێمە ناو ئیسلامەوە، یان دینەکانی دیکەش وەکو گاور و جولەکە یان هەر ڕێبازێکی تر جگە لە ئیسلام بە دروست دەزانێت، بەڵام ئاگادار بن ئەم قسانە هەمووی قسەی پووچن هیچ ڕێباز و دینێک بەدەر لە ئیسلام لای الله تعالى قبووڵنەکراوە و خاوەنەکەشی لە قیامەت زەرەر دەکات و لە کافرانە، لەبەر ئەوەی الله تعالى دەفەرموێت:

(وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (آل عمران : ٨٥)

واتە : ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە.

ڕاستە وتمان دینی پێغەمبەرانی تریش هەر تەوحید بووە، بەڵام وتیشمان شەریعەتی دینەکان جیاواز بووە، ئێستا الله تعالى تەنیا شەریعەتی رسول الله (محمد ﷺ) ی قبووڵە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

"والذي نفسي بيده لو أصبح فيكم موسى عليه السلام، ثم اتبعتموه وتركتموني لضللتم، إنكم حظي من الأمم، وأنا حظكم من النبيين. "

واتە سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر سبەی داهات و موسا علیه السلام لە ناوتاندا بوو، پاشان شوێنی ئەو کەوتن و وازتان لە من هێنا ئەوا گومڕا دەبن، چونکە ئێوە بەشی منن لە ئوممەتەکان، وە منیش بەشی ئێوەم لە پێغەمبەران.

مسند أحمد : ١٥٨٦٤

:لێرەدا رسول الله ﷺ مەبەستی ئەوەیە کە ئەو کۆتا پێغەمبەرە و دەبێت هەموو خەڵکی تەنها شوێنی ئەو بکەون ﷺ.

جا زۆر کەس هەن کە شوێنی عەلمانیەت و دیموکراسیەت و لیبرالیەت کەوتوون و خۆشیان بە موسوڵمانی عەیارە ٢٤ دەزانن، با بزانن هەر یەکێک لەوانە دینێکە بۆخۆی، دەبێت خۆیان یەکلایی بکەنەوە یان ئیسلام یاخود دیموکراسیەت، یان تەوحید یان کوفر.

بەڵگەی دیکەش زۆر هەن بەڵام ئەمەندە بەسە.

#پۆستی : (٦)

## بە کێ دەوترێت موسڵمان؟

موسوڵمان ئەو کەسەیە کە خۆی تەنها و تەنها تەسلیمی الله کردووە، ملکەچیەتی، فەرمان و نەهیەکانی الله جێبەجێ دەکات.

بە حوکمەکانی الله ناڵێت:

چۆن؟

بۆ؟

چۆن الله شتی وا دەکات؟

ئەمە توندوتیژیە و دژی مافی مرۆڤ و ئازادییە .

ئەمە بۆ ئەم سەردەمە نابێت!

یان نایەت دەقە شەرعییەکان بە جۆرێک لێک بداتەوە کە لە مانا ئەسڵەکەی خۆی لای بدا بۆ ئەوەی دڵی کافران و مولحیدانی پێ ڕازی بکات.

بەڵکو دەڵێت : مادەم فەرمانی الله یە ئەوە ڕاسترین و باشترین فەرمانە.

موسوڵمان ئەو کەسەیە کە هەموو کارێک لە توانایدا بێت دەیکات بۆ ئەوەی الله تعالى لە خۆی ڕازی بکات، ئەوەتا الله لە ئایەتی پێش کۆتایی سوڕەتی البقرة باسی ئیمانداران دەکا و لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت:

(وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ) (**البقرة : ٢٨٥**)

واتە : وە وتیان گوێمان لێبوو وە گوێڕایەڵیش دەبین، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین، دەسا تۆیش لێمان خۆش ببە ئەی پەروەردگارمان! چاکیش دەزانین کە سەرەنجام گەڕانەوەمان تەنها بۆ لای تۆیە.

#پۆستی : (٧)

## پێناسەی ئیسلام

ئیسلام بریتییە لەوەی کە تەسلیمی الله عز وجل ببیت بە تاک و تەنهایی، وە ملکەچ بیت بۆی بە عیبادەت کردن، وە خۆت بەریئ بکەیت لە کافران و کوفرەکانیشیان.

بەڵگەش بۆ ئەم پێناسەیە ئەوەیە کە الله عز وجل دەفەرموێت:

»وَمَا أُمِرُوا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ« (**البينة : ٥**)

واته : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە الله بپەرستن و بە پاکی و دڵسۆزی، لابدەن لە هەموو ئایینێک و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەرێک و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی ڕاست و بەنرخەکانی الله عز وجل.

بەڵام زۆر کەس هەیە دەڵێ واز لە بەریئ بوون و شت بێنە حەقم نییە بەسەر کافرەکانەوە بۆ خۆم نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و تەواو!! ئێ باشە نوێژ بکە و ڕۆژووش بگرە بەڵام نابێت تۆ کە هاتویتەتە ناو ئیسلامەوە خۆت جیا نەکردبێتەوە لە ڕێبازەکانی غەیری ئیسلام، سەیر بکەن الله تعالی چۆن باسی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکات علیه السلام:

»قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ« (الممتحنة : ٤)

واتە : بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون سەرمەشقێکی چاکتان بۆ هەیە، کاتێک کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله عز وجل دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە الله دەهێنن بە تاک و تەنها.

بۆیە ڕەحمەتت لێبێ دیقەت بدە پێشەواکەت ئیبراهیم مەوقیفی چۆن بووە بەرامبەر قەومەکەی خۆی لەبەر ئەوەی تەوحیدیان قبوڵ نەکرد، تۆش هەڵوێستت وابێت بەرامبەر ئەو کەسانەی کە تەوحید قبووڵ ناکەن.

#پۆستی : (٨)

## پایەکانی ئیسلام

(-عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم «بُنِيَ الإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ.)

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

ئیسلام لەسەر پێنج شت بونیاد نراوە؛ شایەتی دان بەوەی کە هیچ پەرستراوێک نییە بەحەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله، وە محمد یش نێردراوی الله یە، وە نوێژکردن، وە زەکات دان، وە حەج کردن، وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

صحيح البخاري : ٤٥١٥

باشە ڕەحمەتت لێبێت، هیچ شتێک هەیە بەبێ کۆڵەکە و پایە خۆی ڕابگرێت؟ بێگومان نەخێر، دەی ئەمانە کۆڵەکەی دینەکەی تۆن، چۆن دەبێت تۆ زانیاریت نەبێ بە کۆڵەکەی دینەکەت یان پشت گوێی بخەیت و ئیشی پێ نەکەیت؟ ئەگەر زانیاریت لەسەر ئەوانە نەبێت و جێبەجێیان نەکەیت کۆڵەکەی دینەکەت لەسەر چی ڕاگرتووە؟

**ان شاء الله ئەو پێنج پایەیە هەمووی یان بەشێکیان لە داهاتوودا ڕوون دەکەینەوە، چونکە پێویستە موسڵمان بزانێت چی دەکات و چی ناکات نەک نەزانانە تەقلیدی ئەو خەڵکە چی کرد بیکاتەوە و بێ ئەوەی بزانێت مەوزوع چییە.**

**#پۆستی : (٩)**

## پایەکانی ئیمان

**فەرموودەیەکی صحیح هەیە کە پیاوێک دێتە لای پێغەمبەر ﷺ جلەکانی زۆر سپی بووە و ڕیشی زۆر ڕەش بووە هیچ شوێنەواری گەشتیاری پێوە دیار نەبووە جا ئەو پیاوە جبریلە دێت چەند پرسیارێک لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، یەکەم پرسیاریشی لە بارەی ئیسلامەوەیە، دوای ئەوەی جبریل پرسیار دەربارەی ئیسلام لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەوجا لێی دەپرسێت ئیمان چییە؟ پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دەداتەوە:**

(أنْ تُؤمِنَ باللهِ، وَ مَلائِكتَهِ، وَ كُتُبِهِ، وَ رُسُلِهِ، وَ اليَومِ الآخِرِ، وَ تُؤمِنَ بالقَدَرِ خَيرِهِ وَ شَرِه)

**واتە : ئەوەیە باوەڕ بهێنیت بە الله، وە فریشتەکانی، وە کتێبەکانی، وە پێغەمبەرانی، وە ڕۆژی دوایی، وە بە قەزا و قەدەر بە خێر و شەڕییەوە.**

**صحيح مسلم : ٨**

**إن شاء الله لە چەند پۆستێکی داهاتوودا هەر یەک لە پایەکانی ئیمان ڕوون دەکەینەوە.**

## پایەکانی ئیمان : ٢

**ئێستا دێین هەر شەش پایەکەی ئیمان ڕوون دەکەینەوە إن شاء الله تعالى:**

***باوەڕهێنان بە الله بریتییە لەوەی باوەڕت بەوە بێت تەنیا الله پەرستراوی تاک و تەنهای حەقە و پەروەردگارتە، هەر ئەو مرێنەر و ژیێنەر و ڕۆزیدەر و بەڕێوەبەری کار و باری ئاسمانەکان و زەوییە، وە باوەڕیشت بە هەموو ناو و سیفاتەکانی هەبێت وەک چۆن لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە بە تێگەیشتنی سەلەف، وە نابێت لەگەڵ الله ـدا کەسێکی تر بە پەروەردگار و پەرستراو بزانیت یاخود بەندایەتیت بۆ کەسێکی تر پێ دروست بێت، وە بەندایەتی بکەیت بۆ کەسێکی کە لە غەیری الله، هەروەها دەبێت ناو و سیفاتەکانی وەکو خۆی جێگیر بکەیت، چۆن هاتووە ئاوا بە ڕێی بکەی نەک بچی یەکی بخەیت یان بیچوێنی بە دروست کراوەکانی یاخود لە خۆتەوە لێکی بدەیتەوە، ئەگەر ئەم کارانە بکەیت ئەوا ئیمانت بە الله هەڵدەوەشێتەوە.**

***باوەڕهێنان بە فریشتەکان ئەوەیە تۆ گومانت نەبێت کە ئەوان دروستکراوانێکی الله عز وجل ن و هیچ گوناه و تاوانێک ناکەن، نابێت بڵێیت خوارفیاتە و فریشتەی چی و شتی چی، ئەگەر وات وت ئیمانت هەڵدەوەشێتەوە.**

*باوەڕهێنان بە کتێبەکانی بریتییە لەوەی بڕوات وابێت کە ئەوانە لە لایەن الله ـوە نێردراون و کەلامی الله ن، وە باوەڕیشت هەبێت بەوەی کە لە قورئاندا هەیە و هەمووی بە ڕاست بزانیت، ئەگەر گومانت لە ڕاستی و دروستی قورئان هەبێ ئیمانت هەڵدەوەشێتەوە.

إن شاء الله لە پۆستێکی دیکەدا سێ پایەکەی دیکەی ئیمان ڕوون دەکەینەوە.

#پۆستی : (١١)

## پایەکانی ئیمان : ٣

باوەڕهێنان بە پێغەمبەران علیهم السلام : بە هەمان شێوە نابێت هیچ پێغەمبەرێک بە درۆ بخەیتەوە، وەک گاور و جولەکە کە پێغەمبەر محمد ﷺ بە پێغەمبەر نازانن، یاخود بە پێغەمبەری ئەزانن بەڵام باوەڕی پێناکەن و شوێنی ناکەون . ئەگەر تەنها یەک پێغەمبەر بەدرۆ بخەیتەوە ئەوە هەموو پێغەمبەرانت علیهم السلام بەدرۆ خستووەتەوە، چونکە دەعوەی هەموویان یەکێک بووە و جیاواز نەبووە، دەعوەیان بۆ بەتەنهاپەرستنی الله و شوێنکەوتنیان بووە . هەروەها دەبێت باوەڕت بە هەموو فەرموودە صحیحەکان هەبێت چونکە بەبێ گومان ئەو فەرموودانە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە.

وە لە قورئانیشدا الله تعالی لە چەندین ئایەتدا فەرمانی کردووە بە گوێڕایەڵی کردنی خۆی و پێغەمبەر ﷺ بۆ نموونە ( مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ) (النساء : ٨٠)

واتە : هەر کەس گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکا ئەوا گوێڕایەڵی الله ی کردووە، ئەوەشی پشتی تێبکا خۆ ئێمە تۆمان نەناردووە تا ببیتە پارێزەر بەسەر ئەوانەوە.

چەندەها ئایەتی دیکەش جەخت لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ دەکەنەوە دەی ئەگەر شوێنکەوتنی ئەو بە فەرموودە نەبێت چۆنە؟ تۆش هاتووی دەڵێی فەرموودە هەمووی هەڵبەستراوە باشە جا ئەگەر هەمووی هەڵبەسترابێت فەرموو چۆن ئەو ئایەتانە جێبەجێ بکەین؟ خۆ نە ئایەتێکە و نە دوانە و نە سییانە هەمووی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بە گوێی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بکەین.

إن شاء الله لە داهاتوودا زیاتر باسی فەرموودە دەکەین.

باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە بڕوات هەبێت بە زیندووبوونەوە لە دوای مردن، وە بڕواشت هەبێت بە حەشر و حساب و بەهەشت و جەهەننەم، وە هەر شتێکیش کە پەیوەندی بە قیامەتەوە هەیە وەکو محمد ی مهدی و هاتنی دەججال و گەڕانەوەی عیسا علیه السلام و . . هتد، ئەگەر ئەمانە ڕەد بکەیتەوە و بڵێی خورافیاتە یان هەر چی تر بڵێی مەبەستت بە درۆ خستنەوەی بێت ئەوا ئیمانت هەڵدەوەشێتەوە.

#پۆستی : (١٢)

# پایەکانی ئیمان : (٤)

**باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر بە خێر و شەڕییەوە : بریتییە لەوەی بڕوات وابێت هەر شتێک ڕوو دەدات خێر بێ یان شەڕ، تاوان بێ یان چاکە، بچووکترین شت تا گەورەترینیان، هەموو ئەمانە الله پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی نوسیوونی لە لوح المحفوظ ـدا، وە علمی هەبووە کە ڕوو دەدا، ویستی لێبووە ڕوو بدا، وە الله هەر کەسێکی بوێت هیدایەتی دەدات و هەر کەسێکیشی بوێت گومڕای دەکات.**

**جا زۆر کەس وا لە قەدەر تێگەیشتوون کە ئێمە الله هیدایەتمان دەدا بەڵام ئێمە خۆمان گومڕا دەبین!!! ئەمە کارەساتە تۆ وا تێگەیشتبێتی چونکە تۆ بەم قسەیەت بێ ئەوەی هەست بە خۆشت بکەی دەڵێیت الله ویستی چاکی بۆم هەیە بەڵام من خراپە دەکەم!!! واتە ویستی خۆت بە زاڵتر دەزانی، تەبعەن لەوانەیە بڵێی مەبەستم ئەوە نەبووە بەڵام ئەوە واتاکەیەتی.**

**الله تعالی دەفەرمووێت :** (إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ (٢٧) لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ (٢٨) وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) **(٢٩)التكوير**

**واتە : ئەمە تەنها یادخستنەوەیەکە بۆ جیهانیان، بۆ هەر کەسێک لە ئێوە کە بیەوێت ڕێگەی ڕاست بگرێتەبەر، وە ناشتوانن هیچ ویستێکتان هەبێ مەگەر پێش ئەوە الله ویستی لێی هەبێت.**

**جا دیقەتی ئایەتەکە بدەن لە کۆتاییدا دەڵێ ئێوە ناتوانن ویستتان لێی هەبێ ئیللا ویستی الله لە پێش هی ئێوەوەیە، ئەسڵەن سەبەبی دابەزاندنی ئایەتی کۆتایی ئەوەبوو کە ئەبو جەهل وتی شتەکە بەدەست خۆمان هەر کات ویستمان لێبێ هیدایەت وەردەگرین وە هەر کاتیش ویستمان لێنەبوو وەری ناگرین، جا الله ئایەتی کۆتایی دابەزاند کە شتەکە لەدەستی خەڵکی نییە.**

**وە ئەمە بە واتای ئەوەش نایەت کە الله ڕازییە و پێی خۆشە هەندێ کەس گومڕا بن، بەڵکو بە واتای ئەوە دێت کە ئیرادەیەکی کەونی لەسەر ئەوە بووە کە فڵانە کەس فڵانە تاوان ئەنجام بدا یان فڵانە گومڕایی بکات .**

**#پۆستی : (١٣)**

**مەرجەکانی قبوڵ بوونی شایەتمان : (١)**

**شایەتمان دوو بەشە، یەکەمیان شایەتیدانە بەوەی هیچ پەرستراوێک نییە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە الله، دووەمیشیان شایەتی دانە بەوەی محمد ﷺ بەندە و نێردراوی الله یە.**

**زانراوە کە بەندە بە وتنی شایەتمان دێتە ناو ئیسلامەوە، بەڵام نابێت تەنیا وەکو وشەیەکی بیانی بیڵێت و نەزانێت واتای چییە، چونکە ئەوکات وەکو کلیلێکی بێ ددانی لێ دێ و سوودی نابێت بۆت.**

**بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەمان ئەم ڕیوایەتەیە : بە وهبی کوڕی منبە وترا : ئایا کلیلی دەرگای بەهەشت لا اله الا اللّه نیە؟ فەرمووی : بەڵێ، بەڵام هیچ کلیلێک نیە ئیللا ددانی هەیە، وە گەر هاتوو کلیلێک ددانی هەبوو ئەوە دەرگاکەت بۆ دەکاتەوە گەر ددانی نەبوو ئەوا دەرگاکەت بۆ ناکاتەوە.**

**صحیح البخاري : تەعلیقی پێش فەرموودەی ژمارە ١٢٣٧**

جا ڕەحمەتت لێبێت تەماشا بکە مەس هەیە شایەتی لەسەر شتێک بدا و نەزانێت ئەو شتە چییە؟ بۆیە فێر بە بزانە تۆ کە هاتویتەتە ناو ئیسلامەوە بەهۆی چ شتێکەوە هاتووی نەک بە تەقلیدی, ئەو خەڵکە عەوامە چییان کرد تۆش وا بکەیت.

لە داهاتوودا إن شاء الله تعالى باسی مەرجەکان دەکەین.

#پۆستی : (١٤)

## مەرجەکانی قبوڵ بوونی شایەتمان : (٢)

یەکەم جار باسی بەشی یەکەمی شایەتمان دەکەین کە شایەتیدانە بە لا إله إلا الله، کە دوو پایە و هەشت مەرجی هەیە واجبە هەموو کەس ئەو دوو پایە و هەشت مەرجەی لە خۆیدا جێ بە جێ کردبێت و بیانزانێت.

لا إله إلا الله واتە هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله، لە پێناسەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو ئەو شتانەی لە غەیری الله دەپەرسترێن دەبێت ڕەت بکرێنەوە و نەفی بکرێن و نابێت بە پەرستراو دابنرێن کە ئەمە پایەی یەکەمە، وە پایەی دووەمیش ئەوەیە کە الله وەکو تاکە پەرستراوی ڕاستەقینە و حەق جێگیر بکەین.

بەڵگە بۆ ئەم قسانەش بەم ئایەتە دێنینەوە کە الله تعالى دەفەرمووێت :

(ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ) (سورة الحج : ٦٢)

واتە : وە بەم شێوازە الله پەرستراوی ڕاستەقینەیە وە بەڵێنەکانی ڕاستەقینەیە، وە ئەوانەی کە جگە لە الله دەپەرسترێن ئەو پەرستراوانە هەموویان پووچەڵ و بەتاڵ و بێ بنەمان وە بە دڵنیایی الله زۆر بەرز و بڵندە لە زاتی پیرۆزیدا وە لە کردەوەکانیدا، وە الله زۆر گەورەیە.

کەواتە تۆی موسڵمان دەبێت هەموو ئەوەی کە جگە لە الله دەپەرسترێن بە پووچەڵ و ناڕەوایان بزانیت، وە شوێنکەوتەکانیشیانت لا کافر بێت، وە زاتی الله بە پەرستراوی ڕاستەقینە بزانی و شوێنکەوتەکانی ئیسلامت لا موسڵمان بێت.

وە ڕەحمەتیشت لێبێت مەڵێ من حەقم بەسەر پەرستراوی باتڵ و شوێنکەوتوانیان چییە؟!، نەخێر تۆ دەبێت خۆت لە هەموویان دارنیت و لێیان بەری بیت، چونکە بەڕاستی ئەوە ڕێبازی پێغەمبەر ابراهیم علیه السلام بووە کە الله تعالى فەرمانی بە ئێمەش کردووە شوێنی بکەوین، بڕوانە ئایەتی ٤ لە سوڕەتی الممتحنة.

#پۆستی : (١٥)

# مەرجەکانی قبووڵ بوونی شایەتمان : (۳)

له قورئاندا چوار شت باسکراوه که کافران جگه له الله پەرستویانه، ئەوانیش :

آلهة : کۆی وشەی - إله - که بریتیه لەو شتەی دەپەرسترێت له پێناو سوود یان زیان گەیاندن، بەڵگەش بریتییه له فەرمایشتی الله : «أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ» الأنبياء (٤٣)

واته : ئاخۆ ئەوانه - جگه له الله - چەند خوایەکیان هەیه دەتوانن له سزای ئێمه بیانپارێزن؟ کەچی ئەو خوا ناحەقانه خۆیان ناتوانن یارمەتی خۆیان بدەن و له لایەن - الله - ـوه هیچ یارمەتیشیان بۆ نییه.

أنداد : بریتییه لەوەی مەیل و خۆشەویستی زیاد له حەددی پێ ئەدرێت به وێنەی ئەو خۆشەویستیەی که به الله دەدرێت، بۆ نمونه دەبینی زۆر کەس لای جنێو به الله بدرێت دەڵێت کەیفی خۆیەتی هەر کەس بۆ قەبری خۆی، بەڵام وەرە جنێو به ئاڵا و خاک و عەشرەتی بدە، والله له دەستی بێت لەوانەیه بتکوژێت.

جا بۆیه الله دەفەرموویێت : «وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ . » (البقرة : ١٦٥)

واته : هەندێک لەم خەڵکه هەیه لەگەڵ ئەوەشدا تێناگەیت الله به تەنها بپەرستێ، هێشتا چەند هاوتا و چەند هاوبەشێکی بۆ دادەنێت خۆشیان دەوێن وەک خۆشەویستی الله، وه ئەوانەی ئیمانیان هێناوه الله یان خۆشتر دەوێت.

أرباب : بریتییه لەوانەی شەرع بۆ خەڵک دادەنێن و یاسایان بۆ دادەرێژن و یاساکان و دەدەنەوه پاڵ شەریعەتی الله و به ناوی دینەوه دەیڵێن، وەکو یەکێک له سەره گەورەکانی حیزبه بەناو ئیسلامیەکان ئەڵێت دیموکراسیەت له ئیسلامەوه وەرگیراوه! دیموکراسیەتێک که کوفره ئەیداته پاڵ دینی الله عز وجل، الله له قورئاندا باسی زاناکانی ناو گاور و جولەکه دەکا که ئاوا دینیان بۆ خەڵک دارشتووه و وتویانه ئەمه شەریعەتی الله یه، هەر وەک دەفەرمووێت : «ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ » (التوبة : ٣١)

واته : گاور و جولەکه حاخام و قەشەکانی خۆیان کردووەته پەروەردگاری خۆیان له جیاتی الله (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش به ئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن. )

الطاغوت : بریتییه لەو کەسەی که سنووری بەندایەتی بەزاندووه بۆ خوایەتی، جا دەکرێت ببێته یەکێک لەو سێیەی سەرەوه به ڕەزامەندی یان داواکاری خۆی، الله دەفەرمووێت : «أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا»

واته : ئەرێ ئەوانەت نەدیوه که بەشێ له تەوراتیان پێ دراوه و بڕوایان به بت و طاغوت هەیه و به کافرەکان دەڵێن ڕێبازی ئەمان باشتره له هی ئیمانداران.

ئەوجا ئینسانی موسڵمان دەبێت لە هەر چواریان و شوێنکەوتەکانیشیان خۆی بەری بکات و بە کافریان بزانێت، وە بە تەنیا الله بپەرستێت، کە وای کرد ئەوا حەقی لا اله الا الله ی داوە.

#پۆستی : (١٦)

## مەرجەکانی قبوڵ بوونی شایەتمان : (٤)

زانیمان ئەوانەی لە غەیری الله دەپەرسترێن چین، ئێستا دێینە سەر ٨ مەرجەکەی لا إله إلا الله کە ئەمانەن

● العلم: هەبوونی زانست بە لا إله إلا الله، نابێت نەزانیت مانالەی چییە، الله دەفەرمووێت : «فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ » (محمد : ١٩)

واتە : بزانە کە هیچ پەرستراوێک شایەنی پەرستن نییە بە حەق جگە لە الله، (جا دیقەت بدەن نەیوت بڵێ، وتی بزانە، لە پۆستەکانی پێشووی ئەم زنجیرەیە باسی واتاکەیمان کردووە. )

●الیقین : واتە دڵنیا بیت و گومانت نەبێت لەوەی کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله تعالی، الله عز وجل دەفەرمووێت : «إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ » (الحجرات : ١٥)

واتە : بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بە الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە . . .

●الإخلاص : واتە پاکی و بێ خەوشی لە لا اله الا الله کە نابێت شیرکی تێ بکەوێت، الله جل جلاله دەفەرمووێت : «وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ» (البینة : ٥)

واتە : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە الله بپەرستن بە پاکی و دڵسۆزی

●الصدق : واتە بەڕاستی الله ت بە تاکە پەرستراوی ڕاستەقینە دانابێت نەک دووڕوویی تێدا بکەیت، وە هەروەها کارێک نەکەی کە لا اله الا الله ـکەت هەڵبوەشێنێتەوە، نەک بە زمان بڵێی لا اله الا الله بەڵام پاڵپشتی لایەنێک بیت کە بەرنامەکەی بەتەواوی دژی لا اله الا الله یە!!!

الله عز وجل دەفەرمووێت : « فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ» (العنكبوت : ٣)

واتە : تا الله ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.

چوار مەرجی تر ماوە بۆ پۆستێکی تر إن شاء الله.

#پۆستی : (١٧)

## مەرجەکانی قبوڵ بوونی شایەتمان : ٥

**درێژەی مەرجەکانی لا إله إلا الله**

●**المحبة** : واتە خۆشەویستی هیچ شتێک نەهێنیتە ئاستی خۆشەویستی الله (بۆ نمونە ئاڵا و زمان و نەتەوە و خاک و سروودی نیشتیمانی و . . . هتد)

هەر وەکو دەفەرموویێت : « (البقرة : ١٦٥)

واتە : لەناو خەڵکدا هەیە هاوبەش بۆ الله پەیدا دەکەن و بەقەد الله خۆشیان دەوێن، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە الله یان لە هەموو شتێک خۆشتر دەوێت.

●**الإنقياد** : واتە ملکەچ بوون تەنها بۆ الله و ئەنجامدانی ئەو بەندایەتیانەی لەسەرت واجبن، چونکە تۆ دانت بەوە ناوە کە هیچ پەرستراوێک شایەنی پەرستن نییە جگە لە الله، کەواتە دەبێت تەسلیم بوونی تەواوەتی بۆ الله دەرببڕی، الله دەفەرموویێت : «وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ . . » (الزمر : ٥٤)

واتە : هەوڵ بدەن هەمیشە و بەردەوام دڵتان لای الله بێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن.

●**القبول** : ڕازی بوون بەوەی الله پەرستراوی حەقە و ئەوانی دیکە هەموویان پوچەڵ و درۆن، واتە هەموو ئەوانەت قبوڵ بێت کە لا إله إلا الله لەخۆی گرتووە، جیاوازیەکەشی لەگەڵ ملکەچ بوون ئەوەیە کەوا قبوڵ پەیوەستە بە ناخەوە، بەڵام ملکەچ بوون ڕووکەشە واتە دەبێت ناخ و ڕووکەشت یەک شت بێت، الله تعالی دەفەرموویێت : «فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا» (النساء : ٦٥)

واتە : سوێند بە پەروەردگارت ئیمان ناهێنن هەتا تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم نەکەنە دادوەر لە هەر دووبەرەکییەک کە لە نێوانیان هەیە (تا ئێرە ملکەچ بوونە)، وە دواتر لە نەفسی خۆیاندا هەست بە بێزاری نەکەن لەو بڕیارەی تۆ داوتە بەڵکو تەسلیم بن بە تەسلیم بوونێکی تەواو (تا ئێرەش قبووڵ کردنە. )

●**الکفر بما یعبد من دون الله** : واتە بێ بڕوابوون بە هەموو ئەو شتانەی لە غەیری الله دەپەرسترێن و خۆیان بەو پەرستنە ڕازین، ئەبێت بە درۆ و پوچیان بزانی و لێیان بەریئ بیت و خۆیان و شوێنەوکتووانیان بە کافر بزانیت :

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ» (لقمان : ٣٠)

واتە : ئەمە لەبەر ئەوەیە بێگومان تەنها الله ڕاستە و حەقە و بەڕاستی ئەوەی هاواری لێ دەکەن و دەیپەرستن بێجگە لەو بەتاڵ و ناڕاستە.

جا موسڵمانان ڕەحمەتتان لێبێ ئەم مەرجانە لە خۆتان جێبەجێ بکەن و هەوڵ بدەن بە کورتی بیزانن ئەگەر دینەکەتان لەلا گرنگە، چونکە هەر کەس ئەم مەرجانەی لە خۆیدا جێبەجێ نەکردبێت ئەوا تەنها وتنی لا إله إلا الله هیچ ئیسفادەیەکی پێ ناگەیەنێت.

#پۆستی : ١٨

## مەرجەکانی قبوڵ بوونی شایەتمان : ٦

لە دوای ڕوونکردنەوەی بەشی یەکەمی شایەتمان، ئێستە دێین باسی بەشی دووەمی دەکەین کە بریتییە لەوەی شایەتی بدەی محمد ﷺ پێغەمبەری الله یە، ئەویش ٤ شت لە خۆ دەگرێ کە ئەمانەن:

١ - بەڕاست زانینی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین : واتە هەر فەرموودەیەکی صحیحت بۆ هات لە پێغەمبەرەوە دەبێت بڕوای پێ بکەی و بەڕاستی بزانیت.

چونکە الله تعالی دەفەرمووێت : «وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ (٣) إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ (٤) عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ (٥)» النجم

واتە : ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیڵێ لە هەوەس و ئارەزووی خۆیەوە نییە، بەڵکو ئەوەی دەیڵێ هەمووی لە وەحییەوە، جیبریلی بە توانا فێری کردووە.

کەواتە ئەوە بزانە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیڵێ هەمووی لە لایەن الله ـوەیە و جیبریل فێری کردووە، جا بۆیە مەڵێن بڕوامان بە فەرموودە نییە ڕەحمەتتان لێبێت، چونکە وەک چۆن قورئان وەکو وەحی هاتووە بۆ رسول الله

ﷺ بە هەمان شێوە فەرموودەش بە وەحی هاتووە.

٢ - نابێت عیبادەت بکەین مەگەر بەو شێوازە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی؛ ئەمەش خاڵێکی ترە کە موسڵمانانی ئێستە زۆر لێی بێ ئاگان، لە خۆیانەوە عیبادەت دادەهێنن وەک بڵێی دینەکە خۆیان هێنابێتییان، چەندەها فەرموودەی صحیحمان هەیە کە هەر شتێک داهێنرابوو واتە پێغەمبەر ﷺ یان هاوەڵانی نەیان کردبوو ئەوە گومڕاییە و لەلای الله تعالی ش وەرناگیرێت.

یەکێک لەو فەرموودە صحیحانە بریتییە لەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»

واتە هەر کەس هەر کارێکی کرد و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبوو ئەوە ڕەد دەکرێتەوە.

صحيح البخاري: ژمارە ٢٦٩٧

کەواتە موسڵمانان ڕەحمەتتان لێبێت لەخۆتانەوە عیبادەت دامەهێنن و مەیکەن، تەنیا ئەوە بکەن کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی.

دوو خاڵەکەی دیکە بۆ پۆستێکی تر إن شاء الله.

#پۆستی : (١٩)

## مەرجەكانی قبوڵ بوونی شایەتمان : ٧

**٣ - گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەر ﷺ لە هەر شتێكدا كە فەرمانی پێكردووە.**

**٤ - دووركەوتنەوە و نەكردنی هەر شتێك كە پێغەمبەر ﷺ نەهی و ڕێگری لێكردووە.**

**الله تعالى دەفەرموویت :** « وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ » (**الحشر : ٧**)

**واتە : وە هەرچی پێغەمبەر ﷺ پێیدان و فەرمانی پێكردن وەریگرن، و لە هەرچیش ڕێگری لێكردن مەیكەن و ئێوەش ڕێگری لێ بكەن، وە لە الله بترسن چونكە الله سزای توندی هەیە.**

**یان دەفەرموویت :** «مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ» (**النساء : ٨٠**)

**واتە : ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكات ئەوا بە گوێڕایەڵی الله ی كردووە. . .**

**ئێستە بزانە ڕەحمەتی الله ت لێبێت كە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ حەرام یان حەلاڵی كردبوو وەكو ئەوە وایە كە لە قورئان هاتووە، چونكە بە وەحی بۆی هاتووە و لە خۆیەوە هیچ شتێكی نەوتووە، وە مەشڵێ هەڵبەستراون و درۆیە فەرموودە نین هەر قسەی خەڵكە و بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستراوە.**

**دەی ئەگەر هەڵبەستراو بن چۆن من ئەم ئایەتانە و چەندین ئایەتی تر جێ بەجێ بكەم؟ چۆن ئەو واجبە لە خۆمدا بە دی بێنم كە الله فەرمانم پێ دەكا بە شوێنكەوتنی ئەو ﷺ؟ مەگەر هەر بە شوێنكەوتنی فەرموودە نابێت؟ جا ڕەحمەتت لێبێت ئەوەی بە صحیحی بۆت هات وەریگرە و ڕەتی مەكەرەوە.**

#پۆستی : (٢٠)

## ئایا الله تعالى لە چ گوناهێك خۆش نابێت؟

**ئەو گوناهەی كە الله تعالى لە خاوەنەكەی خۆش نابێت ئەگەر لە پێش مردن تەوبەی لێ نەكات بریتی نییە لە كوشتن و دزی و زینا و . . . هتد، بەڵكو ئەو گوناهە گەورەیە بریتییە لە كوفر و شیرك، واتە باوەڕنەهێنان بە الله و هاوبەش بۆ دانانی، وە هەر كامێكیان بكەیت هەموو كردەوەكانت سفر دەبێتەوە و پێویستە سەر لە نوێ شایەتمان بێنیتەوە و تەوبەش لە كوفر و شیركەكەشت بكەیت هەتا بگەڕێیتەوە ناو ئیسلام.**

**الله تعالى دەفەرموویت :** « إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ » (**النساء : ٤٨**)

**واتە : الله لەوە خۆش نابێت كە هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێت، بەڵام لە هەر گوناهێك جگە لە هاوبەش دانان بۆی خۆش دەبێت بۆ ئەو كەسەی كە بیەوێت.**

وە دەفەرمووێت : « وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ » (الزمر : ٦٥)

واتە : ئەی محمد ﷺ بە ڕاستی وەحی بۆ تۆ و ئەوانی پێش تۆش نێردراوە ئەگەر هاوبەشت بۆ الله بڕیاردا ئەوا کردەوەکانت سفردەبێتەوە وە لە زەرەرمەندانیش دەبیت.

ئایا مەسەلەیەکی ئاوا گەورە هێندە کەمە کە تۆ لێی کەمتەرخەم بیت و نەزانیت چییە؟ ئایا هێندە ناهێنێت کە خۆت فێر بکەیت بۆ ئەوەی خۆتی لێ بپارێزیت؟

#پۆستی : (٢١)

کوفر و شیرک چین؟ وە چەند جۆرن؟

کوفر و شیرک دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١ -کوفر و شیرکی گەورە.

٢ - کوفر و شیرکی بچووک.

جا بزانە ڕەحمەتت لێبێت ئەی موسڵمان، هەر وەک چۆن نوێژ بە دەرچوونی یەک شت لە پاش و پێشت بەتاڵ دەبێتەوە و ڕۆژووش بە یەک قوم ئاو بەتاڵ دەبێتەوە، بەهەمان شێوە لا إله إلا الله ش بە یەک کوفر و شیرکی گەورە بەتاڵ دەبێتەوە و پێی کافر دەبیتەوە با پێشتر وتبێتیشت لا إله إلا الله، کە کوفر و شیرکت ئەنجامدا پێویستە سەر لە نوێ شایەتمان بهێنیتەوە و تەوبەش لە کوفر و شرکەکەشت بکەیت ئەوجا دەبیتەوە موسڵمان. دیقەتی واتای لا إله إلا الله بدەن؛ « لا إله » واتە هیچ (پەرستراوێک) خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت، کە ئەمە کوفرە بە تەنیا بەڵام گەر وتت « إلا الله : بێجگە لە الله » دەبێتە ئیسلامەتی و تەوحید، جا تەماشا بکەن تەنیا هەناسەیەکیان بەینە بۆیە ڕەحمەتت لێبێت ئەم مەسەلەیە پشتگوێ مەخە.

الله تعالى دەفەرمووێت: ( إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ ) (الزمر : ٧)

واتە : ئەگەر ئێوە کوفر ئەنجام بدەن ئەوا الله دەوڵەمەندە و پێویستی پێتان نییە وە بە هیچ شێوەیەک بە کوفر ڕازی نییە بۆ بەندەکانی.

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێت : «من مات يشرك بالله شيئا دخل النار»

واتە هەر کەس بمرێت شەریکی بۆ الله بڕیاردابێت دەچێتە ئاگرەوە.

صحيح البخاري : ١٢٣٨

بەڵام کوفر و شرکی بچووک ئەگەر ئەنجامی بدەیت پێی کافر نابی، خۆ ئەوە نەبێ گوناهێکی بچووک بێت، بە پێچەوانەوە گوناهێکی زۆر گەورەیە لە پیاو کوشتن و زینا گەورەترە بەڵام پێی کافر نابیتەوە بە ئەنجامدانی، إن شاء الله لە پۆستەکانی داهاتوو چەند جۆرێک لە هەردووکیان باس دەکەین.

#پۆستی : (٢٢)

## ئایا مرۆڤ هەتا کەی بەندایەتی بکات؟

**پێش ئەوەی بچمە ناو زنجیرەی کوفر و شیرکی گەورەوە، پێم باشە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە.**

**وەڵامەکەی بریتییە لەوەی کە بەندە پێویستە هەتا ئەو کاتەی کە ڕۆح لە جەستەی ماوە بەردەوام بێت لە عیبادەت کردن، نابێت ماوەیەک بیکات و ماوەیەکی دیکە وازی لێ بێنێت دەنا ئەوەی پێشووتریش کردویەتی بەتاڵ دەبێتەوە.**

**الله تعالی دەفەرموویت : «** وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ **» (الحجر - ٩٩)**

**واتە : هەتا ئەو کاتەی دەگەیتە دڵنیایی پەروەردگارت بپەرستە.**

**جا ئیمامی بوخاری دەفەرموویت سالمی کوڕی ابن عمر دەفەرموویت دڵنیایی واتە مردن .**

**تفسير الطبري**

**جا ئەگەر نمونەیەک بهێنینەوە؛ تەماشاکەن لە هەموو شوێنێک بوون بە ئەندام زەحمەتترە وەک لە وازهێنان لێی، بۆ بوون بە ئەندام دەبێت یەکەم جار چەندەها شوێن بکەی و ئیمزای فلان و فیسار کۆبکەیتەوە و تا وەردەگیرێی، دواتریش دەبێت لە ژێر مەرجەکانی ئەو شوێنە هەڵسوکەوت بکەی، بەڵام بۆ دەرچوون لێی یەک وەرەقەی ئیستیقالەت بەسە، یاخود هەڵەیەکت لێ ببینن دەرت دەکەن.**

**جا بۆ مەسەلەی دینیش وایە دەبێت هەتا مردن لە ژێر ئەو مەرجانە دەرنەچیت کە لە قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەف هاتووە.**

#پۆستی : (٢٣)

## کوفری گەورە : (١)

### کوفری بە درۆخستنەوە و ئینکاری لێکردن

### ئازادیخواز

**بریتییە لەوەی ئایەتێک یان فەرموودەیەکی صحیح بە درۆ بخەیتەوە؛ ئیتر بەهەر بیانوویەک بێت، تەنانەت ئینکاری لە تاکە پیتێکی قورئان بکەی کافر دەبیتەوە.**

**جا ئیتر بە حسابی خۆت لەگەڵ ئەقڵت ناگونجێت، یان بە خورافیاتی ئەزانیت یان هەر شتێکی تر یان بە دژی مافی مرۆڤ و ئازادی ئەزانی بۆیە ناچێت بە مێشکتدا.**

**یان ئەو حوکمەی کە لە ئایەت و فەرموودەکە هاتووە ئینکاری لێ بکەیت، بڵێی وانییە بۆ نمونە پێنج پایەکەی ئیسلام لەسەر هەموو کەسێکی عاقڵ و باڵغ فەرزە تۆ بێی بڵێی نەخێر فەرز نییە، جا ئەوە کوفری گەورەیە و پێی کافر دەبیتەوە.**

الله تعالى دەفەرموویت : ( بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ ۚ ) (يونس : ٣٩)

واتە : نەخێر، کە باوەڕیش ناهێنن هی ناتەواوی قورئان نیە بەڵکو بە درۆی دەزانن و لە مانا و مەبەستەکانی تێنەگەیشتوون.

یان دەفەرموویت : ( قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ) (الأنعام : ٣٣)

واتە : بەڕاستی ئێمە دەزانین کە بێگومان ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن غەمبارت دەکات بەڵام بێگومان ئەوان تۆ بەدرۆزن دانانێن بەڵکو ئەو ستەم کارانە ئایەتەکانی الله ئینکاری لێ دەکەن.

جا لەبەر ئەوە ئەگەر علمت نییە لەخۆتەوە هیچ شتێک بە درۆ مەخەرەوە و ئینکاری لێ مەکە، بۆ ئەوەی ئیسلامەتییەکەت پارێزراو بێت.

#پۆستی : (٢٤)

## کوفری گەورە : ٢

## کوفری گاڵتە پێکردن و بەکەم زانین

بە گشتی بریتییە لەوەی گاڵتە بەو شتانە بکەیت کە الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێ کردووە، یاخود شتێکی خۆت یان کەسێکی ترت پێ باشتر بێت لەوەی کە ئەوان فەرمانیان پێ کردووە.

جا ئیتر لە بچوکترین شتی ئیسلامەوە تا گەورەترین شت حسابی کە؛ بۆ نمونە هەیە گاڵتە بە ڕیش و نیقاب دەکات، یاخود حوکمەکانی الله تعالى وەکو دەست بڕینی دز، جەڵد کردن و بەرد باران کردنی زیناکار بە کۆنەپەرستی و وەحشی گەری دەزانێت و ناوی لێ دەنێت پێچەوانەی مافی ئافرەت و مافی مرۆڤ و . . . هتد، بە چاوی خۆتان ڕۆژانە ئەم کوفرانە دەبینن ئیتر هەم لە ناو خەڵکدا و هەمیش لە پەرلەمان ئەمانە دەوترێت.تۆش دێی دەنگیان پێ دەدەیت؟ یان خۆت هەڵخەڵەتاندووە دەنگ بە حزبە بەناو ئیسلامییەکان دەدەیت؟ ئەوان دەچن ئایەت دەخەنە دەنگ دانەوە، واتە ئایەتەکە ئەهێننە ئاستی قسەی کەسێکی ئاسایی!! جا ئەگەر قسەی کەسەکە دەنگ زیاتر بێنێت هیچ حساب بۆ ئایەتەکە ناکرێت!!!جا دڵنیابە، هەموو تەمەنت نوێژ بکەیت ئەم سیفەتەت تێدا بێت واللە کافریت، بزانە الله چی دەفەرموویت دەربارەی ئەوانەی گاڵتەیان بە پێغەمبەر ﷺ کرد کاتێک چوون بۆ غەزای تەبووک:

(وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ ) (٦٦)(التوبة)

واتە ئەگەر لێیان بپرسیت دەڵێن هیچ نەبوو تەنیا گاڵتە و سوعبەتمان دەکرد، بڵێ ئەوە گاڵتەتان بە الله و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکرد، هیچ عوزر مەهێننەوە تازە کافر بوون دوای ئەوەی ئیمانتان هێنابوو.

جا سەیرکە فەرموویەتی بە سوعبەتیشیان بووە، بۆیە بە سوعبەتیش بێ خۆت بپارێزە لە گاڵتەکردن بە دین دەنا کافر دەبیتەوە.

#پۆستی : (٢٥)

## کوفری گەورە : (٣)

### کوفری جنێودان و ڕق لێبوونەوە و بە سوک سەیرکردن

ئەمەیان بریتییە لەوەی کە کەسێک جنێو بدات بە الله، یان پێغەمبەرەکانی یاخود کتێبەکانی و دینەکەی و شەعائیرەکانی بۆ نمونە ڕیش و حیجاب و . . . هتد.لەوانەیە بڵێن بۆچی ئەمە باس دەکات؟ کەس هەیە نەزانێت جنێودان بەمانە هێڵی سوورە و هەرکەس ئەنجامیدا پێی کافر دەبێت؟

لە وەڵامدا دەڵێم بۆیە باسی دەکەم چونکە زۆر بەناو مەلا و بانگخواز پەیدابوونە شەو و ڕۆژ دەخەنە سەر یەکتر تاکوو چەواشەی ئەو خەڵکەی پێ بکەن، سبحان الله موسڵمانان بە ناو مەلای وا هەیە دەڵێ ئەگەر کابرا جنێویدا بە الله تعالی و جاهل بوو و نەیزانی ئەوا لەسەری حساب نییە و کافر نابێت!ئاخر ئەمە چەواشە نەبێت چی چەواشەیە؟! باشە تۆ ئەگەر جنێو بدەن بە ناموست و ژن و خوشک و دایکت دەڵێی نەیزانیوە و عوزری بۆ دێنیتەوە؟؟سوێند بە الله نەخێر کەس شتی وا ناکا، مەگەر کابرا هیچ غیرەتی نەبێت، ئەی چۆن عوزر بۆ ئەو کەسە دێنیتەوە کە ڕقی لە شتێکی ئەم ئیسلامەیە و سوکایەتی پێ دەکات و جنێوی پێدەدا؟بۆیە موسڵمانان ڕەحمەتتان لێبێت دینەکەتان بە بێ نرخ سەیر مەکەن و گوێ لەو چەواشەکارانە مەگرن.

#پۆستی : (٢٦)

## کوفری گەورە : (٤)

### کوفری تەککەبوور و پشت کردنە دینی الله

ئەمەیان هەر وەکو ئەو کوفرەی ئیبلیس و فیرعەونە کە خۆیان بە گەورە زانی لە ئاست فەرمانی الله عز و جل، هەروەها پشتییان کردە بەرنامەی الله.

الله تعالی دەفەرمووێت : «وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ» (البقرة : ٣٤)

واتە : جا کاتێک بە فریشتەکانمان فەرموو سوجدە ببەن بۆ ئادەم، هەموویان سوجدەیان برد تەنها ئیبلیس نەبێت کە گوێی پێ نەدا و خۆی بە گەورە زانی و لە کافران بوو.

وە الله تعالی دەربارەی فیرعەون دەفەرمووێت : «فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ» (الذاريات : ٣٩)واتە : فیرعەونیش ڕووی وەرگێڕا و سەرپێچی کرد بەهۆی دەسەڵاتەکەیەوە وە وتی : (مووسا) جادووگەرە یان شێتە.جا لێرە سەرنج بدەن؛ ئایا ئیبلیس ئەو کاتە و ئێستەش بڕوای بەوە نییە کە الله تاک و تەنهایە و بەس خۆی دروستکەر و ڕۆزی دەر و ژیێنەر و مرێنەر و . هتد ـە؟لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ بڕوای بەوانە هەمووی هەیە، دەیزانی کە الله تاکە و وە هەر خۆشی داوای لێکرد کە تا قیامەت بیهێڵێتەوە کەواتە بڕوای بە قیامەتیش هەیە.دەی من دەپرسم ئایا ئەو بیروباوەڕەی ئیبلیس وای لێکرد کە کافر نەبێت؟ نەخێر چونکە

کوفری ئەنجامدا، بۆیە بزانە ڕەحمەتت لێبێت کوفر و ئیمان لە دڵێکدا جێی نابێتەوە، چۆن الله بە تاک دەزانیت لە کاروبارەکانیدا دەبێ ئاوا لە پەرستنیشدا بە تاک ڕاییگریت و بەس ئەو بپەرستی و هیچ کوفرێکیش ئەنجام نەدەیت، وە لە ناو و سیفاتە بەرزەکانیشیدا بە تاک ڕاییگریت ئەگەر نا ئیسلامت نییە و کافر دەبیتەوە.

#پۆستی : (٢٧)

## کوفری گەورە : ٥

### کوفری گومان و دووڕوویی

بریتیە لەوەی کە گومانت هەبێت لە ڕاستی و دروستی ئەوەی الله تعالی ناردوویەتیە خوارەوە، جا بە ڕووکەش وا نیشان دەدەیت کە قەناعەتت پێی هەیە بەڵام لێی بە گومانی و لە ناخەوە قەناعەتت پێی نییە. بۆ نمونە، زۆرێک لە کچان ئەڵێن با قەناعەتمان بۆ دروست بێت بە حجاب ئینجا ئەیکەین!!! واتە قەناعەتی بە حوکمی حیجاب نییە کە الله تعالی لە قورئانەکەدا فەرزی کردووە، بەڵکو گومانی لێی هەیە و ئەڵێت بۆچی من جوانیەکانی خۆم داپۆشم و من ئازادم هەر شتێک بکەم و ئەم حیجابە دژی ئازادی ئافرەتانە و . . . هتد

الله تعالی دەفەرمووێت : ( وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا (٣٥) وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا (٣٦) قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا )(٣٧)(الكهف :)واتە بە نێو باخەکەیدا گەڕا و ستەمی لە خۆی کرد و وتی هەرگیز باوەڕناکەم ئەمەم لەدەست دەربچێت، باوەڕناکەم ڕۆژی دوایی بێت و ڕوو بدات، خۆ ئەگەر (پاش مردن) بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم هەڵبەت باشتر لەمەم دەست دەکەوێت، هاوەڵە ئیمانداڕەکەی لە کاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت : ئەوە باوەڕت نەماوە بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاک دروست کردووە؟! لەوەودوا نوتفەیەک بوویت، پاشان کردیتی بە پیاوێک!!

وە دەفەرمووێت : ( إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ) (النساء : ١٤٥)

واتە بە ڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خوارەوەی ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت.

#پۆستی : (٢٨)

## کوفری گەورە : ٦

### کوفری وازهێنان لە عیبادەتکردن

بریتییە لەوەی وازبهێنیت لە پەرستنی الله تعالی، واتە ئەو شتانەی لەسەرت فەرزە نەیانکەیت، جا هەندێکی ئەگەر چی بە فەرزیشی بزانیت بەڵام نەیکەیت پێی کافر دەبیت وەکو نوێژ.

الله تعالی دەفەرمووێت : ( مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ) (الروم : ٣١)واتە بگەڕێنەوە بۆ لای و لێی بترسن و نوێژ بکەن و لە ڕیزەی ئەوانە مەبن شەریکی بۆ پەیدا دەکەن.

یان جل ثناوە دەفەرموویێت : ( فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ )(التوبة : ١١)

:واگە ئەگەر تۆبەیان کرد و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا ئەوا ئەوە کات براتانن لە دیندا بەم شێوازە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون ئەکەینەوە درێژەی پێ ئەدەین بۆ کەسانێک کە زانیاریان هەبێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت :

إن بين الرجل و بين الشرك و الكفر ترک الصلاة. واتە نێوان پیاو و شیرک و کوفر بریتییە لە وازهێنان لە نوێژ.

صحيح مسلم : ژمارە ٨٢

-عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەفەرموویێت هەر کەسێک واز لە نوێژ بهێنێت دینی نییە.

تعظيم قدر الصلاة للمروزي

بەڵگەی لەمانە زۆر زیاتر هەن، جا دیقەت بدەن لە هیچ کامیاندا نەهاتووە ئەگەر بڕوای بە نوێژەکە نەبوو ئەو کات کافرە، بەڵکو تەنیا بە تەرک کردنی نوێژەکە کافر دەبێ، لە لای زانایانی سەلەف (هاوەڵان، تابعین، ئەتباعی تابعین) تەرک کردنی یەک نوێژ بە ئەنقەست هەتاوەکو کاتەکەی بەسەردەچێت کوفر بووە.

#پۆستی : (٢٩)

## کوفری گەورە : ٧

### من لم یکفر الکافر فهو کافر

واتە هەر کەس کافر بە کافر نەزانێت ئەوا خۆی کافرە، سەرەتا دەمەوێت بڵێم ئەم قاعیدەیەم لە گیرفانی خۆم دەرنەهێناوە ئەمە لە زانایانی ئیسلامەوە وەرم گرتووە و ئەوان بە کاریان هێناوە.

واتاکەی ئەوەیە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا دەرکەوێت کافرە بەڵام تۆ بێیت بڵێی من بە کافری نازانم, ئەگەر وات وت ئەوا خۆت کافر دەبیتەوە، بۆ نمونە لە لای هەندێک بە ناو بانگخواز دەبینی دەڵێ ناتوانین نەسڕانی و جولەکە بە کافر بزانین!!!!

دەی والله بەم قسەیە خۆت کافر دەبیتەوە چونکە الله تعالی لە چەندین شوێنی قوڕئان بە کافریان دادەنێت، وە ئەگەر تۆ بە کافریان دانەنێیت ئەوا قوڕئان بە درۆ دەخەیتەوە.

الله تعالی دەفەرموویێت : ( لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ ۘ ) (المائدة : ٧٣)

:واتە ئەوانە کافربوون کە وتیان الله یەکێکە لە سێ خواکە (واتە نەسڕانیەکان. )

یان دەفەرموویێت ( إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ ) (البينة : ٦)

:واتە ئەوانەی کە کافر بوون لە ئەهلی کتاب و ئەوانەش کە شەریکیان بۆ الله بریاردا ئەوا لە ئاگری جەهەننەم دەمێننەوە بە هەتاهەتایی وە ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانن. ئەهلی کتاب واتە گاور و جولەکە، وە زۆرێک لە بەڵگەی دیکە هەیە لەسەر کافربوونیان، جا تۆ ئێستە چۆن جورئەت ئەکەی ئەوانە بە کافر نەزانیت؟ ئێستە تۆ کەسێک کە بڵێ لا إله إلا الله و کوفرت لێی نەدیبێت جورئەت ناکەی بە کافری بزانی دەی ڕەحمەتت لێبێت تۆ کە کەسێک دەبینی بە ئاشکرا کوفر دەکا تۆ چۆن جورئەت دەکەی بە موسڵمانی بزانیت؟ !!!جا بزانە ڕەحمەتت لێبێت هەر کەس کوفر بکا با پێشتریش وتبێتی لا إله إلا الله، کافر دەبێتەوە چونکە هەر وەک چۆن ئاو و ئاگر کۆنابنەوە بە هەمان شێوە کوفر و ئیمانیش کۆنابنەوە لە دڵێکدا، تۆش بە کافری دابنێت و بۆ ئەوەی کە خۆت کافر نەبیتەوە.

#پۆستی : (٣٠)

## کوفری گەورە : ٨

### کوفری جێگیر نەکردنی ناو و سیفاتەکانی الله تعالی

ئەمەیان بریتییە لەوەی کە ئەو ناو و سیفاتانەی کە الله تعالی لە قورئان جێگیری کردووە یاخود لە فەرموودەی صحیح پێغەمبەر ﷺ و ئاثاری هاوەڵان رضي الله عنهم بۆیان جێگیر کردووە تۆ بێیت جێگیری نەکەیت بۆی. لای ئەهلی سوننە جێگیرکردنی سیفاتی الله بریتییە لەوەی کە وەکو خۆی لەسەر ڕووکەش بەبێ گۆڕینی ماناکەی (تحريف و تأويلی گروپە کافرەکان) و بێ ئەوەی بشڵێن نازانین مانای سیفەتەکە چییە (تفويض) جێگیری دەکەن، وە هەروەها ناشڵێن ئەو سیفەتە چۆنە و چۆن نییە چونکە چۆنێتییەکەی تەنها الله دەیزانێت، هەروەها سیفاتەکان بە هیچ شێوەیەک ناشوبهێنن بە سیفەت مەخلوقەکانی الله تعالی، چونکە هیچ شتێک لە الله ناچێت.

جا ئەو گروپانەی کە کەوتوونەتە ناو ئەم کوفرەوە ڕاستەوخۆ ناوێرن بڵێن جێگیری ناکەین بەڵکو دێن لێکدانەوەیەکی بۆ دەکەن و ماناکەی دەگۆڕن.

بۆ نمونە الله تعالی دەفەرمووێت : ﴿قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ (ص : ٧٥)

فەرمووی ئەی ئیبلیس چی وای لێ کردیت سوجدە نەبەیت بۆ ئەوەی کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردووە .

لێرە و لە چەند ئایەتی دیکە الله سیفاتی دوو دەست بۆ خۆی جێگیر دەکات، ئەهلی سوننە وەکو خۆی بۆی جێگیر دەکەن بە بێ ئەوەی چۆنێتییەکەی بزانن چونکە دەستی الله تعالی لە هی دروستکراوەکانی ناچێت و بەس خۆی دەزانێت دەستی چۆنە، بەڵام گروپە گومڕا و زەندیقەکان ناوێرن بە ئاشکرا بڵێن دەستی نییە بەڵکو دەڵێن دەست لێرە مەبەستی دوو نیعمەتە!!! جا ئەی موسڵمان ڕەحمەتت لێبێت هەر سیفاتێک لە قورئان و فەرموودە هەبوو وەکو خۆی جێگیری بکە بۆ الله کە دیارترینیان بریتیە سیفەتی علو، سیفەتی علو واتە الله تعالی بە ذاتی خۆی لەسەر عەرشە وەک چۆن لە دەیان ئایەتی قورئان و سەدان فەرموودە و هەزاران ئاثاری سەلەفدا هاتووە، وە مەیشوبهێنە بە مەخلوقەکانی، ئەگەر ئەمەت جێبەجێ کرد ئەوا خۆت پاراستووە لە کوفری پەکخستنی سیفاتەکانی الله تعالی. لەو گروپە کافرانەی سیفەتەکانی الله تعالی پەک ئەخەن بریتین لە جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدی و کوللابی و رافضە کان.

## شیرکی گەورە : ١

شیرک واتە هاوبەش بڕیاردان بۆ الله تعالی، بە گشتی بریتییە لە ئەنجامدانی هەر جۆرە پەرستنێک لە پەرستنەکان بۆ غەیری الله عز وجل، پەرستن بە تەنها سوجدە بۆ بردن و تەواف کردن نییە، بەڵکو چەندین جۆری تریشی هەیە، هەربۆیە تۆی موسڵمان دەبێت بزانیت جۆرەکانی پەرستن چین تا هەمووی تەنیا بۆ الله تعالی تەرخان بکەیت و نەکەویتە ناو شرکەوە و کردەوەکانت بەتاڵ نەبنەوە.

## شیرکی داوا و هاوار لێکردن

بریتییە لەوەی داوا یان هاوار لە غەیری الله عز وجل بکەیت بۆ شتێک کە تەنها الله عز وجل خاوەنیەتی، وا بزانیت گوێی لێتە یاخود بە هاناتەوە دێت، جا ئەو کەسە یان ئەو شتەی بانگی دەکەیت لە غەیری الله عز وجل یان ئەوەتا کەسێکی مردووە لە پێغەمبەران علیهم السلام و پیاوچاکان، یان قەبرێکە یان بتێکە یاخود کەسێکە کە غائبە و لە نزیکت نییە و دەنگت نایگاتێ. ئەم شرکە زۆر زۆر باوە لە ناو خەڵکدا، بۆ نمونە ئەڵێت : پێغەمبەر فلانە شتت بەسەر بێت، یان یا حەزرەتی غەوز، یان دەچنە لای گۆڕەوە داوا لە مردووەکە دەکەن دوعاکانیان بە الله بگەیەنێت! بە بیانووی ئەوەی کە ئەو پیاوچاکەی ناو گۆڕەکە نزیکی ئەکاتەوە لە الله تعالی و خۆی ڕووی نییە ڕاستەوخۆ داوا لە الله عز وجل بکات !!! خۆ کافرەکانی قوڕەیشیش هەر ئەوانەیان هەبوو الله تعالی بە کافر و موشریک لە قەڵەمی دان.

ئەوجا با لەم ئایەتانە وردبیینەوە بۆ ئەوەی جوانتر تێبگەین، الله تعالی لە بارەی موشریکەکانی قوڕەیشەوە دەفەرمووێت : ( مَا نَعْبُدُهُمْ إلا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ) (الزمر : ٣)

واتە ئێمە نایان پەرستین مەگەر بۆ ئەوە نەبێت کە لە الله نزیکمان بکەنەوە.

جا بەڕای تۆ پەرستنی کافرەکانی قوڕەیش بۆ بت و پیاوچاکەکانیان چۆن بووە؟ لە وەڵامدا دەڵێم الله تعالی دەفەرمووێت ( فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ) (العنكبوت : ٦٥)

واتە جا ئەوان ئەگەر سواری کەشتی بووبان بە تاک و تەنها و نییەتپاکییەوە داوایان لە الله عز وجل دەکرد و بەس هاواریان لەو دەکرد، بەڵام کاتێک الله ڕزگاری دەکردن و دەگەیشتنە وشکانی، ئەوا یەکسەر دەستیان دەکرد بە شەریک دانان بۆی.کەواتە پەرستنەکە زیاتر هاوار لێکردن و بانگکردن بووە واتە شیرکی (دعاء)، وە ئایەتی تر زۆر هەن لە بارەی ئەوەی کە دەبێ تەنیا هاوار لە الله تعالی بکرێت، بۆ نمونە (الاحقاف ٥، المؤمنون ١١٧، الجن ١٨).

ئەوجا هەندێ کەس دەڵێن کاکە ئێوە ئەڵێی ڕقتان لە پێغەمبەر و پیاوچاکانە بۆ نابێ هاواریان لێ بکەین!!! منیش ئەڵێم باشە دەی ئێوە ڕقتان لە الله تعالی یە بۆ بە تەنیا هاوار لەو ناکەن؟پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام وە پیاوچاکان رحمهم الله پێگەی خۆیان هەیە لە دیندا و ئەبێت ڕێزیان لێ بگیرێت، بەڵام نابێت

ببرێنە ئاستی الله عز وجل، چونکە پیاوچاک هەرچەندە چاک بێت سنوورێکی خۆی هەیە و نابێت لەو سنوورە تێپەڕبێت، وە هەموو پێغەمبەرانیش بۆ ئەوە هاتوون تا بە ئێمە بڵێن تەنها هاوار لە الله عز وجل بکەن. وە تەماشای دووعاکانی رسول الله بکە هەمووی بڕیتیە لە (اللهم، یان یا ربي)، واتە داوا لە الله تعالی ئەکات

#پۆستی : (٣٢)

## شیرکی گەورە : ٢

شیرکی گوێڕایەڵی کردنی کەسێک لە حەڵالکردنی شتێک کە الله تعالی حەرامی کردووە، یاخود لە حەرام کردنی شتێک کە الله تعالی حەڵاڵی کردووەئەمەش بەو شێوەیە دەبێت کە شتێک الله تعالی حەرامی کردووە کەسێک دێت حەڵاڵی دەکات تۆش شوێنی دەکەویت و حەڵاڵی دەکەیت ئەمە دەبێتە شیرکی گوێڕایەڵی، وە بە پێچەوانەشەوە شتێک الله تعالی حەڵاڵی کردووە کەسێک دێت حەرامی دەکات تۆش شوێنی دەکەویت و حەرامی دەکەی دووبارە بەمەش موشریک دەبیت، وە ئەو کەسەش کە حەڵاڵ و حەرام دادەنێت و حساب بۆ الله ناکات ئەویش کافرە لەبەر ئەوەی بڕیاردان لەسەر حەرام و حەڵاڵ تایبەتە بە پەروەردگارییەتی الله ـوە و لەوەدا هاوبەشی نییە.

الله تعالی دەفەرمووێت : (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ) (التوبة :٣١)

واتە گاور و جولەکە حاخام و قەشەکانی خۆیان کردە خوا لە غەیری الله، وە عیسای کوڕی مەریەمیشیان کردبووە خوا کەچی تەنیا فەرمانیان پێ کرابوو یەک خوا بپەرستن کە الله یە.الطبري لە تەفسیرەکەیدا لە بارەی ئەم ئایەتەوە لە هاوەڵی بەڕێز عدي کوڕی حاتم ـەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و خاچێکم لە ملدا بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم ئەی عەدی ئەو پەیکەرە لە ملت دابکەنە، عەدی فەرمووی: منیش لە ملم دام کەند و دواتر پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە «مەبەست لە ئایەتەکەی سەرەوەیە «منیش وتم ئەی پێغەمبەری الله ئێمە حاخام و قەشەکانمان نەدەپەرست.

فەرمووی : ئەی ئەوەیان بۆ حەرام نەدەکردن کە الله حەڵاڵی کردبوو ئێوەش حەرامتان دەکرد؟! وە ئەوەیان حەڵاڵ دەکرد کە الله حەرامی کردبوو ئێوەش حەڵاڵتان دەکرد؟وتم : بەڵێ.فەرمووی : جا ئەوە پەرستنیانە.

بەڵگەی دیکە زۆر هەیە لەسەر ئەم جۆرەی شیرک، خۆی ئەنجامدانی کارێکی حەرامی وەک قەتل و زینا و هتد کوفر نییە و تاوانی گەورەیە بەڵام کاتێک دەبێتە کوفر کە بە حەڵاڵی بزانیت، جا دەبینی لەم سەردەمەی خۆماندا لە ناو پەرلەماندا زینا ڕێگەپێدراوە و حەڵاڵە ئەگەر هەردوو لا ڕازی بن بە بیانووی مافی ئازادی تاکەوە !! وە چەندین شت کە الله تعالی حەرامی کردووە لە پەرلەماندا حەڵاڵ کراوە، وە چەندین شت کە الله تعالی حەڵاڵی کردووە لە پەرلەماندا حەرام کراوە، جەنابیشت دەنگیان بۆ دەدەی وا دەزانیت موسڵمانیت! نا والله یەقینت هەبێت تۆش و ئەوانیش کافر و موشریکن.إن شاء الله دواتر بە تایبەتی باسی پەرلەمان و دیموکراسیەت و پرۆسەی دەنگدان ئەکەم.

#پۆستی : (٣٣)

## شیركی گەورە : ٣

## شیركی خۆشویستن

الله تعالى دەفەرمووێت : «وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِۗ» (البقرة : ١٦٥ )واتە هەندێک لە خەڵکی هاوبەش و هاوتا بۆ الله بڕیار دەدەن و خۆشیان دەوێن وەکو خۆشویستنی الله، بەڵام ئیمانداران الله یان زیاتر خۆش دەوێت وەک لە خۆشویستنی ئەم موشریكانە بۆ پەرستراوەكانیان.ئایا تۆ كێت كردووە بە شەریكی الله و لە الله زیاتر خۆشت دەوێت و خۆتی لەسەر بە كوشت دەدەیت و لە پێناویدا تووڕە دەبیت؟ ئاڵای وڵاتەكەت؟ خاكەكەت؟نەتەوەكەت؟ سەرۆكەكەت؟ حیزبەكەت؟یان ڕێزگرتن بۆ ئاڵای ووڵاتەكەت و تەقدیس كردنی و بە پیرۆز سەیركردنی بەقەدەر یان زیاتر لە دروشمە ئایینیەكان، ڕێزگرتن لە سروودی نەتەوەیی بەقەدەر یان زیاتر لە ئایەتەكانی قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ، یان خۆ بە كوشت دانت لە پێناوی خاك و دەنگ لێوە نەهات بۆ دین، ئەمانە هەمووی خۆشویستنی شتانی ترە زیاتر و زۆرتر لە خۆشویستنی الله و لا اله الا الله و ئەهلەكەی.چەندەها جار بینومانە و بیستوومانە كەسێک لەپاڵیدا جوێن بە الله و پێغەمبەر بدە فزەی لێوە نایەت، كەچی جوێن بدە بە سەرۆكە طاغوتەكەی، یان حیزب و ئاڵا و خاكەكەی وا تووڕە دەبێت دەڵێیت ئێستا نەمكوژێت باشە.تۆ لە وڵاتێكدا دەژیت كە دار الإسلام نییە و حوكمی ئیسلامی جێبەجێ ناكرێت، هەر بۆیە نە خاكەكەی ڕێزی هەیە نە ئاڵاكەی وە نە سروودی نەتەوەییەكەی كە پڕە لە كوفر!

#پۆستی : (٣٤)

بۆ ئەوانەی كە كەسانێک بە موسڵمان دەزانن لە كاتێكدا كوفری دونیا دەكەن تەنیا لەبەرئەوەی وتویەتی لا إله إلا الله هارون بن زیاد وتی : گوێم لە الفریابي بوو كە پیاوێک لێی پرسی سەبارەت بەو كەسەی كە جنێو بە أبو بكر رضي الله عنه دەدات؟ فەرمووی : كافرە.وتی : نوێژی لەسەر بكەین؟فەرمووی : نەخێر. لێم پرسی:چی لێ بكەین لە كاتێكدا ئەو دەڵێ لا إله إلا الله؟فەرمووی : دەستی لێ مەدەن، بەڵكو بە دارێک پاڵی پێوە بنێن تا دەیخەنە ئەو چاڵەی بۆتان هەڵكەندووە.كتێبی الإبانة الصغرى : ئەثەری ژمارە ١٩٦

الفریابي پێشەوایەكی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، جا مەبەستمان ئەوەیە كە كوفر و ئیمان لە دڵێكدا جێیان نابێتەوە، كوفر هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامە، هەروەكو چۆن خواردن و خواردنەوە هەڵوەشێنەرەوەی ڕۆژووە، كە تۆ لە بەیانیەوە تا ئێوارە بەڕۆژوو بوویت بەڵام لە پێش كاتی خۆی قومێک ئاو بخۆیتەوە ئەوا ڕۆژووەكەت بەتاڵە، كوفریش بەهەمان شێوەیە كە تۆ كوفرت كرد هەموو كارەكانی پێشووت لە ئیسلام بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێ شایەتمان بێنی و تەوبەش لە كوفرەكەت بكەی.

#پۆستی : (٣٥)

## شیركی گەورە : ٤

### سەربڕین بۆ غەیری الله تعالی

بریتیە لەوەی كەسێک حەیوانێک سەرببڕێت بۆ رسول الله ﷺ، یان بۆ فلانە شێخ، یاخود بۆ فیسار قەبر و مەرقەد، یان سەرۆک حیزبێک، لە دڵی خۆیدا نیەتەكەی وابێت یان لە كاتی سەربڕیندا ناوی الله و ناوی كەسێكی تری لێ دەهێنێت، یان تەنها ناوی ئەو كەسە ئەهێنێت كە لە غەیری الله تعالی بۆی سەرئەبڕێت، جا ئەنجامدانی ئەوانە شیركە و حەیوانەكەش گۆشتەكەی حەرام دەبێت . چونكە حەیوان سەربڕین جۆرێكە لە جۆرەكانی عیبادەت دەبێت تەنها بۆ الله تعالی ئەنجام بدرێت، هەموو سەربڕینێک دەبێت تەنها و تەنها ناوی الله عز وجل بهێنیت، تەنانەت نابێت ناوی پێغەمبەریشی ﷺ لێ بهێنیت، جا ئەم جۆرەی شیرک لە ناو سۆفی و دەروێش و قەبر پەرستەكاندا زۆر باوە.الله عز وجل دەفەرموویت : ( قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ )(الانعام : ١٦٢)

واتە : ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ نوێژ كردن و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم بە تەنها بۆ الله یە كە پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە.ئەوجا ڕەحمەتتان لێبێت تێبگەن ئەی موسڵمانان هەر شتێک بە عیبادەت حساب بوو تۆ نابێت بۆ كەسی ئەنجام بدەیت جگە لە الله تعالی.

#پۆستی : (٣٦)

## عەلمانییەت و دیموكراسیەت : ١

### سەرەتا با بزانین مانای هەر یەک لەم دوو وشەیە چییە.

عەلمانییەت واتە : جیاكردنەوەی دین لە دەوڵەت، دین هیچ مافی نەبێت بەسەر دەوڵەتەوە و نابێت دین دەوڵەت ببات بەڕێوە، واتا نابێت دین ئاڕاستەی دەوڵەت بكات. دیموكراسیەت واتە : حوكمی گەل، تەعزیم كردنی تاک و بە گەورە سەیر كردنی بڕیارەكانی، واتە لێرە مرۆڤەكان بە پێی هەوەس و ئارەزووی خۆیان بڕیار دەدەن، زۆرینەی خەڵكی چیی ویست ئەوە ئەبێت بە یاسای دەوڵەت.بەڵام ئایا الله تعالی لەمە ڕازییە؟ الله تعالی كتێبێكی لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە ناردووەتە خوارەوە كە مایەی ڕێنموونی و هیدایەتی مرۆڤەكانە، ئەوەی مرۆڤ پێویستی پێی هەیە لەو كتێبەدا بوونی هەیە، جا تێبگە ڕەحمەتت لێبێت ئایا دەكرێت ئەم كتێبە و بڕیارەكانی ناوی پشت گوێ بخەین و بێین بە هەوەس و ئارەزووی خۆمان حوكم بكەین؟!

(قَدْ جَاءَكُم مِّنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ )المائدة : ١٥)

خەڵكینە لەلایەن الله تعالی نوورێكمان بۆ هاتووە كە ڕۆشنكەرەوەی دونیا و قیامەتمانە، ئەم قورئانە ڕوونكردنەوەی تێدایە بۆ ئەو شتانەی كە مرۆڤ پێویستیەتی لە دین و دونیادا.حەیف نیە ئەم نوورە بگۆڕینەوە بە تاریكی دیموكراسی و عەلمانیەت و دەستوری پڕ كوفر و شیركی وڵاتەكان و یاساكانی پەرلەمان و پەیڕەو و پرۆگرامی حیزبەكان؟!مەبەستی عەلمانیەكان و دیموكراسیەكان ئەوەی حساب بۆ حوكمەكانی الله تعالی و پێغەمبەرەكەی نەكەن، بەڵكو بە كەیفی خۆیان هەر شتێكیان ویست بیكەن، وە ئەیانەوێت الله تعالی حەقی نەبێت بەسەر ئەوەی كە چۆن ئەژین و چی بكەن و چی نەكەن.

#پۆستی : (٣٧)

## عەلمانییەت و دیموکراسیەت : ٢

**لە خۆت بپرسە ئەم حیزبانە بەرنامە و پرۆگرامیان چییە؟ ئایا بەرنامەیان ئەوەیە کە حوکم بۆ ئەوە بگێڕنەوە کە الله دایبەزاندووە؟ ئایا بەرنامەیان ئەوەیە کە حوکم بە حوکمی الله تعالی بکرێت؟ یان ئەوەتا حوکم بە دیموکراسیەت و ڕای گەل ئەکەن و هەوا و ئارەزووی خۆیان ئەکەن؟ئاشکرایە کە عەلمانییەکان و بە ناو ئیسلامییەکانیش حوکم بە قورئان و سوننەت ناکەن بەڵکو هەردووکیان دیموکراسیەتیان لا پەسەندە! بگرە عەلی باپیر لە ڤیدیۆیەکدا ئەڵێت کە دیموکراسیەت لە کرۆکی ئیسلامەوە وەرگیراوە ! یاعنی دیموکراسیەتێکی کوفری سەرچاوەکەی ئیسلامە! ئەوان کاتێک ئەبن بە ئەندام پەڕلەمان سوێند دەخۆن بە قورئان کە حوکم بە قورئان نەکەن و حوکم بەو دەستورە بکەن کە خۆیان دایانڕشتووە کە دژی دینە، ئەو دەستوورە پڕە لەو یاسا کوفریانەی کە حەڵاڵی خوای گەورە حەرام ئەکەن و حەرامی خوای گەورە حەڵاڵ ئەکەن، تۆش دەنگیان پێ دەدەیت بەهۆی دەنگی تۆ دەبن بە ئەندام پەڕلەمان ! پێت وانیە تۆ شەریکی ئەم کارەیان بیت؟لەو دەستوورەدا چەندین یاسای تێدایە کە دژی یاساکانی الله تعالی و پێغەمبەرەکەیەتی صلی الله علیە وسلم، وە سوکایەتی و دژایەتیەکی ئاشکرا و ڕوونی تێدایە بۆ ئیسلام.**

پۆستی : (٣٨)

## عەلمانییەت و دیموکراسیەت : ٣

### دەزانیت لەناو پەڕلەماندا چی لە قورئان و سوننەت دەکرێت؟

**حزبە بە ناو ئیسلامییەکان بە هەموو عەقڵییانەوە دێن ئایەتەکانی الله تعالی دەخەنە دەنگدانەوە، دەزانیت ئەمە مەعنای چییە؟مەعنای ئەوەیە کە ئەگەر ئایەتەکە دەنگی زۆرینە نەهێنێت ئەوا پشت گوێ دەخرێت!!! بەڵام ئەگەر قسەی یەزیدیەک یاخود مولحیدێک یان گاور و جولەکەیەک دەنگ زیاتر بهێنێت ئەوا ئیش بە قسەکەی دەکرێت!!!کەواتە لێرە بۆمان دەردەکەوێت کە لە ناو پەڕلەمان دەنگی زۆرینە زاڵە بەسەر کەلامی الله دا!!! چ کوفرێک لەمە وازحترە کە تۆ قبوڵی بکەیت ئاوا سوکایەتی بە ئایەتەکانی الله تعالی بکرێ؟لە پەرلەماندا قسەی تۆ و قسەی فڵانە کەس و قسەی الله هیچ فەرقی نییە و هەمان حسابیان بۆ ئەکرێت.**

**الله عز وجل دەفەرموێت :** ( وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ) **(النساء : ١٤٠)**

**واتە وە لە قورئاندا بۆتان دابەزیوە کە هەرکات ئایەتەکانی الله کوفری پێکرا و گاڵتە و سوکایەتی پێکرا ئەوا ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن لەو مەجلیسە، هەتاوکو ئەوو قسانە دەگۆڕن و دەست بە قسەی دیکە دەکەن، ئەگەر دانیشتن لەگەڵ ئەوانە بە دڵنیاییەوە ئێوەش وەکو ئەوانن (واتە هاوشێوەی ئەوان بەشدارن لەو کوفرە)، بە ڕاستی الله کۆکەرەوەی کافران و دووڕووانە لە دۆزەخدا.یەزیدیەکان ئەوجا تۆش ڕەحمەتت لێبێت خۆت لە**

هەموو حیزبەکان بەری بکە و دەنگ بە هیچیان مەدە، چونکە دەنگ بە هەر کامیان بدەی شەریکی لەوەی کە چی دەکات لە پەڕلەماندا.

#پۆستی : (٣٩)

## عەلمانییەت و دیموکراسیەت : ٤

### ئایا پەڕلەمان شورایە؟

حیزبە بەناو ئیسلامییەکان کاتێک لێیان بپرسی بۆ بەشداری دیموکراسیەت دەکەن، لە وەڵامدا دەڵێن: کاکە با حوکم بۆ ئەو عەلمانیانە جێ نەهێڵین بە تەنها بەڵکو بەسەریان سەرکەوین و دەنگ زیاتر بێنین!باشە تۆ کێ پێی وتی بەو شێوەیە بەسەریدا سەرکەوە؟ یەعنی بە هەموو عەقڵت پێت وایە کە کابرای عەلمانی بهێڵێ لەو پرۆسەیەی بۆ خەڵەتاندنی تۆ دایناوە ببیت بە سەرۆکی ئەو و بەسەریدا سەربکەویت؟

الله تعالی ئەفەرمووێت ( وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ) (البقرة : ١٢٠)

واتە ئەی رسول الله ﷺ گاور و جولەکە لێت ڕازی نابن هەتا شوێن دین و بەرنامەیان نەکەویت، جا تۆ بڵێ بەڵکو ڕێنمونی ڕاستەقینە ڕێنمونیەکەی الله یە، وە ئەگەر تۆ شوێنی هەوەس و ئارەزووی ئەوان کەوتی دوای ئەوەی کە ئەم عیلمەت بۆ هات ئەوا لای الله هیچ دۆست و سەرخەرێکت نابێت.

ئەوجا ئەگەر ئەم هەڕەشەیە لە پێغەمبەر ﷺ کرابێت تۆ کێیت؟

هیچ کاتێک لە پرۆسەی شیرکی دەنگداندا سەرناکەون، ئەگەر لێشیان بپرسی : کاکە گریمان ئێوە دەنگتان زیاتر هێنا و بەسەر عەلمانیەکان سەرکەوتن، ئایا حوکم بە قورئان و سوننەت دەکەن؟

دەڵێن نەخێر ئێمە دەوڵەتی دینیمان ناوێ دەوڵەتی مەدەنیمان دەوێت!!!

#پۆستی : (٤٠)

## عەلمانییەت و دیموکراسیەت : ٥

### ئایا پەڕلەمان و دیموکراسیەت شورایە؟

ئەم ڤیدیۆیە پشت ڕاستکەرەوەی پۆستی پێشوومە کە وتم بەناو ئیسلامییەکان ئەگەر لە عەلمانیەکانیش ببەنەوە دەوڵەتی دینیان ناوێت.جا بۆ ئەو کەسانەی عەرەبی نازان ئەمە بخوێننەوە :

لە مەقطەعی یەکەم دەڵێت: پێمان دەڵێن کە دەوڵەتی دینیتان دەوێت، نا والله دەوڵەتی دینیمان ناوێت، وە هیچ کەسیش دەوڵەتی دینی ناوێت.دەوڵەتی دینی لای ئێمە ڕەفز کراوەتەوە!! ئێمە دەوڵەتی مەدەنیمان دەوێت!!

**لە مەقطەعی دووەم دەڵێت:**

**لە ئیسلامدا و لە جیهانیشدا شتێک بوونی نیە بە ناوی دینی!! وە من دڵنیاتان دەکەمەوە کە ئێمە دەوڵەتێکی مصری، نیشتمانی، مەدەنی، دیموکراسیمان دەوێت کە بە دەستوری سەردەم حوکم بکات!!**

**لە مەقطەعی سێیەم دەڵێت:**

**بانگەواز ناکەین بۆ دەوڵەتی دینی و ناشمانەوێ بە مەفهومی اسرتقراطي، مەفهومی حوکمی ئیلاهی تەواو بووە و بەڵکو هیچ موسڵمانێکی عاقڵ لەسەر زەوی بانگەواز بۆ ئەوە هەر ناکا !!! ئێمە دەوڵەتی مەدەنیمان دەوێت ڕایدەگەیەنم دەوڵەتی مەدەنیمان دەوێت!!**

**لە مەقطەعی چوارەم دەڵێت:**

**هەندێک کەس لە غەیری ئەرێنی هیچ شتێک نابینێت لە ئەمریکا و ئەوروپا، نا بەڵکو ئەوانیش خاڵی ئەرێنیان زۆرە، ئەوان یاسای هاتوچۆی باشتریان هەیە لە ئێمە و ئەوان زیاتر ڕێزی کات دەگرن جا دەبێت ئێمەش وەک ئەوان بین.**

**لە مەقطەعی پێنجەم دەڵێت:**

**جەماعەت هەندێ کەس ئێستەش بە عەقلێەت و زروفی ساڵانی بیستەکانی کۆچیەوە ئەژی!!! (جا بە گاڵتە پێکردنەوە ئەڵێ:) فتوحاتی ئیسلامی، و خەلیفەی تاکی کیشوەرەکان!! کاکە ئەمانە تەواو بووە!!!**

**لە مەقطەعی شەشەم و کۆتایی دەڵێت:**

**جەماعەت هەندێک کەس هەستانەوەی دین یەکسەر بە خیلافەت تێ دەگەن! جا من بەحسێکم کردووە و ناوم ناوە (خەونی خیلافەت)!!! وە تیایدا ڕوونم کردووەتەوە کە ئەمە گاڵتەبازارە.**

**ئەمە قسەکانی بەناو ئیسلامیەکانە، جا نەفەری وا هەیە ئەڵێ کاکە ئاخر فلان کەس هەموو قورئانی لەبەرە، ئێ ڕەحمەتت لێبێت کە ئاوا گاڵتە بە ئیسلام بکا چی لێ بکەین!!**

**لە کۆتاییدا دەڵێم ئێوە ئەم دەستورە کوفریەتان ناو نا شورا بەم قسەیە خۆتان کافر بوونەوە، چونکە حوکمی الله تعالی تان گۆڕی و حوکمەکەشتان دایەوە پاڵ الله تعالی جا وەکو ئەوە وایە بڵێی الله تعالی فەرمانی بەم دەستورە کوفریە کردووە، پەنا بە الله تعالی، ئەوجا من بەریم لە هەموو حزبەکان و دەنگدەرانیشیان، وە ئەوانیش لە من بەرین.**

**لە داهاتوودا مەسەلەی حوکم کردن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە ڕوونتر دەکەمەوە ان شاء الله.**

**#پۆستی : (٤١)**

## الولاء والبراء چییه؟ : (١)

الولاء واته دۆستایەتی و خۆشەویستی، وه البراء واته بەریئ بوون، جا موسڵمان بۆ ئەوەی ئیسلامەتیەکەی بپارێزێت پێویسته ئەم دوانەی هەبێت.

الولاء و البراء یش له پێناو الله تعالی دا ئەوەیه که تۆ هەموو ئەو کەسانەت خۆش بوویت که الله تعالی خۆشی دەوێن، وه له هەموو ئەوانەش بەری بیت که الله عز وجل لێیان بەرییه، هەروەکو فەرموویەتی : (وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ) (التوبة : ٣)

واته وه ئەمه ڕاگەیاندنێکه له لایەن الله تعالی و پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ له ڕۆژی حەجی گەورەدا که الله تعالی بەرییه له موشریکەکان.

جا ئەمه ڕێبازی پێغەمبەر إبراهیم بووه ﷺ، وه هەر ئەم ڕێبازەیه که فەرمان به ئوممەتی ئێمەش کراوه که پەیرەوی بکەین.

هەر وەکو الله تعالی دەفەرموێت : ( قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ) (الممتحنة : ٤)

:واته به ڕاستی له إبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون سەرمەشقییەکی چاک بۆ ئێوەی ئیماندار هەیه که کاتێک به هۆزەکەی خۆیان وت ئێمه له ئێوه و لەوانەش بەرین که له غەیری الله دەیان پەرستن، و بێباوەڕین پێتان وه له نێوان ئێمه و ئێوەدا بۆ هەمیشه دوژمنایەتی و ڕق و کینه دەستی پێکردووه هەتاکو ئەو کاتەی که به تاک و تەنها و به تەوحیدەوە بڕوا به الله دێنن، بەڵام لەوەدا سەرمەشق نیه بۆتان که به باوکی وت داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم خۆ هیچیشم بۆت به دەست نییه لای الله، پەروەردگارا پشتمان پێت بەستووه و بۆ لای تۆ گەڕاینەوه و سەر ئەنجامیشمان هەر بۆ لای تۆیه.

پێغەمبەر إبراهیم و ئەوانەی لەگەڵی بوون بەرائەت و ڕق و دوژمنایەتی خۆیان بەرامبەر کافرەکان ڕاگەیاند، ئەوجا فەرمووی لەوەی که داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی کرد سەرمەشقتان نیه چونکه باوکی کافر بوو، وه داوای لێخۆشبوون بۆ کافر دروست نییه.

#پۆستی : (٤٢)

## الولاء والبراء چییه؟ : (٢)

ئەزانم دایک و باوکت خۆشئەوێت، ئەمه گرنگ نیه هەموو کەس وایه.

بەڵام ئەی دوژمنەکانی دایک و باوکت چی؟ ڕقت لێیانه؟ دژایەتیان ئەکەیت؟ یان خۆشتئەوێن و لەگەڵیان تێکەڵی؟

ئایا گەر دایک و باوکت بزانن تۆ هاوڕێیەتی دوژمنەکانی ئەوان ئەکەیت لێتی قبوڵ ئەکەن؟ لێت ڕازی ئەبن؟

**بێگومان نەخێر**

**ولله المثل الأعلى**

**ئەزانم هەمووتـان الله تعالى ـتان خۆشئەوێت کەستان ڕقتان لێی نیە و دژایەتی ناکەن**

**بەڵام ئەی دوژمنەکانی الله تعالى چی؟**

**ئایا دژایەتی دوژمنەکانی الله تعالى ئەکەن؟ڕقتان لێیانە؟ یان خۆشتان ئەوێن و هاوڕێیەتیان ئەکەن و سەریان ئەخەن؟**

**ئایا الله تعالى لێتان قبوڵ ئەکات و ڕازییە کە دوژمنەکانی ئەوتان خۆشبووێت و هاوڕێیەتی بکەن و سەریان بخەن؟**

**بێگومان نەخێر**

**ئەسڵەن تۆ ئەزانیت دوژمنەکانی الله تعالى کێن تاکو دژایەتیان و پشتگیریان نەکەیت و خۆشتنەوێن؟**

**دوژمنەکانی الله تعالى کافرەکان و موشریکەکانن، ئەوانەن کە دار و بەرد و گۆڕ و دروستکراوەکانی الله تعالى یان کردووەتە شەریک بۆ الله تعالى، ئەوانەن کە حوکمەکانی الله تعالى بە کۆنەپەرستی و حوکمی خۆیان بە ڕۆشنیری دەزانن، دوژمنەکانی الله تعالى ئەوانەن کە بە چەک و دین بەرگری لەم کەسانە دەکەن.**

**ئایا تۆ ڕقت لەمانەیە و دژایەتیان ئەکەیت یان خۆشت ئەوێن و بە دەنگی تۆ هاتوونەتە سەر حوکم؟؟؟**

**ڕقت لەوانە بێ کە الله تعالى ڕقی لێیانە**

**ئەوانەت خۆشبوێ کە الله تعالى خۆشی ئەوێن، بەم شێوەیە ولاء و براء ـت دادەمەزرێت، وە مەشڵێ من هەقی ئەم شتانەم نییە چونکە دڵنیابە بە بێ الولاء والبراء ئیسلامیشت نییە.**

**هەروەکو الله تعالى دەفەرموویت :** ( لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ | (المجادلة : ٢٢)

**واتە نابینی کەسانێک ئیمانیان بە الله و ڕۆژی دوایی هەبێت کە دۆستایەتی کەسانێک بکەن کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەی دەکەن ئەگەر چی باوکیان بن یان کوڕیان بن یان برایان بن یان خزم و کەسیان بن.**

**ئەوجا ڕەحمەتتان لێبێت ئاگاتان لە ولاء و براء بێ، ابو عبیدەی جراح باوکی خۆی کوشت لە شەڕی بەدر، بە هەمان شێوە امام ابو بکر عبدالرحمن ی کوڕی نەدیت دەنا دەیکوشت، وە موصعەبی کوڕی عومەیر عوبەیدی برای کوشت وە امام علی و امام عمر و ئەوان خزمەکانی خۆیان کوشت لە شەڕی بەدر، جا ئەمە لە کاتێکدا ڕویدا کە ئیسلام توانا و هێزی هەبوو بەڵام ئێستە نییەتی.**

**بۆیە الله تعالى دەفەرموویت :** ( لَّا يَتَّخِذِ لْمُؤْمِنُونَ لْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ وَإِلَى ٱللَّهِ لْمَصِيرُ ) (آل عمران : ٢٨)

واته نابێت ئیمانداران کافرەکان بکەن دۆستی خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، جا هەر کەس وای کرد ئەوا هیچ شتێکی لای الله نییە مەگەر ترستان لێیان هەبوو ئەو کات دەتوانن دۆستایەتی دەربڕن بەڵام لە دڵتانەوە خۆشتان نەوێن، وە الله لە نەفسی خۆی ئاگادارتان دەکاتەوە و سەرەنجامیش هەر بۆ لای الله یە.

#یۆستی : (٤٣)

## الولاء والبراء چییە؟ : (٣)

زانراوە کە مرۆڤ واجبە لەسەری لەگەڵ دایک و باوکی باش بێت، وە زانراوە کە شرک گەورەترین گوناهە، وە لەویش گەورەتر ئەوەیە وا لە کەسێک بکەی شرک بکات، وە الله تعالی فەرموویەتی : ( وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ ) (لقمان : ١٥)

:واتە ئەگەر هەوڵیان لەگەڵت دا کە شرک بکەی بە من کە هیچ زانیاریەکت پێی نیە ئەوا بە گوێیان مەکە، بەڵام لە دونیادا بە شێوەیەکی چاک هاوەڵێتیان بکە.

وە أسماء ی کچی أبو بکر رضي الله عنهما ئەفەرموێت : دایکم لە مەککەوە بە سەردان لەگەڵ باوکیدا هاتە لام بۆ مەدینە وە هێشتا مشرک بوو، ئەمەش لە کاتی هاوپەیمانی قورەیشدا بوو کە هاوپەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، جا پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە میوانداری بکەم یان نا، فەرمووی : بەڵێ میوانداری بکە.

## صحيح البخاري : ٣١٨٣ و ٥٩٧٩

جا لەوانەیە پرسیارتان بۆ دروست ببێت کە ئاخۆ بۆ الله تعالی لە ئایەتی ٢٢ ی سورەتی المجادلة نەهی لێکردووین لە دۆستایەتی دوژمنانی خۆی ئەگەر چی باوک و برا و کوڕ و خزمیشمان بن؟ وە هەروەها بۆچی ابو عبید الجراح لە شەڕی بەدر باوکی کوشت و هاوەڵان برا و خزمی خۆیان کوشت؟

لە وەڵامدا دەڵێین : ئەوانە کافری جەنگاوەر بوون، دژی ئیسلام بوون، دەیانویست موسڵمانان بکوژن و دەریشیان کردبوون لە ماڵ و حاڵی خۆیان، جا ئەم جۆرەی کافران دروست نییە دۆستایەتیان بکرێت مەگەر لە ترساندا نەبێت، بۆیە الله دەفەرموێت : ( لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٩) ( (الممتحنة )

:واتە الله تعالی رێتان ناگرێت لەو کافرانەی جەنگیان دژ نەکردوون لەبەر دینەکەتان، وە لە ماڵ و زێدی خۆتان دەریان نەکردوون (وەکو هۆزی خوزاعە) کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و مامەڵەی دادگەرانەیان لەگەڵ بکەن چونکە الله تعالی دادگەرانی خۆش دەوێت، بەڵکو رێگریتان لێ دەکات جەنگیان لە دژ کردوون لەبەر دینەکەتان و لە ماڵ و زێدی خۆتان دەریان کردوون، و پشتیوانی یەکتریان دەکرد لەسەر دەرکردنتان (وەکو خەڵکی مەککە) کە ئێوە دۆستایەتیان بکەن، جا هەرکەس دۆستایەتیان بکا ئەوا لە ستەمکارانە.

کەواتە بۆمان نییە دۆستایەتی کەسانێک بکەن کە شەو و ڕۆژ دەخەنە سەر یەکتر بۆ ئەوەی زیان لە موسڵمانان بدەن و لە زێدی خۆیان وەدەریان بنێن، والله تعالی أعلى و اعلم.

#پۆستی : (٤٤)

## طاغوت : (١)

### طاغوت لە زمانەوانیدا واتە لە سنوور دەرچوو کە لە وشەی الطغیان ـوە هاتووە.

الله تعالی دەفەرمووێت : ( فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ۗ )(البقر ة : ٢٥٦)

واتە هەر کەس کافر بێت بە طاغوت و ئیمان بە الله بهێنێت ئەوا دەستی بە هۆکارێکی زۆر پتەووە گرتووە کە هیچ پچڕانێکی بۆ نییە.

زانایانی تەفسیر لەبارەی تەفسیری وشەی طاغوتەوە ئەفەرموون:

الامام عمر : طاغوت شەیتانە.

ابن عباس : کەعبی کوڕی ئەشرەفە (لە پۆستێکی تر باسی ئەم کەسە دەکەین ان شاء الله)

عیکریمە : فاڵچییەکانە.

الشعبي : ساحیرە.

مالکی کوڕی ئەنەس : هەرچی بپەرسترێت لە جیاتی الله - وە خۆی پێی ڕازی بێت. -

## التفسیر ابن ابی حاتم

هەروەها ابو جعفر الطبري لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت : قسەی ڕاست ئەوەیە کە طاغوت بریتیە لە هەر کەس کە لە سنوری الله دەردەچێت، وە لە بری الله دەپەرسترێت، جا یان ئەوەتا بە زۆر وا لە خەڵکی دەکا بیپەرستن، یان خەڵکی خۆیان بە گوێی دەکەن و دەیپەرستن، ئەگەر چی ئەو پەرستراوە مرۆڤێک بێت یان شەیتانێک بێت یان بتێک یان ساحر و فاڵچییەک بێ.

کەواتە بە کۆکردنەوەی ئەم پێناسانە دەردەکەوێت کە هەر کەس ڕازی بوو بپەرسترێت، یان خەڵکی دەیان پەرست و نەدەهاتە دەنگ و پێیانی نەدەوت مەمپەرستن، یان سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله تعالی ی دابووە پاڵ خۆی وەکو کاهینەکان کە بانگەشەی زانینی غەیب ئەکەن ئەوا طاغوت ـە، وە کاتێک کەسێک سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله تعالی ئەدات بەخۆی ئەوە سنووری بەندایەتی خۆی تێپەڕاندووە و بووە بە طاغوت.

خۆ کەسانێک هەن دەپەرسترێن و بەریین لەو پەرستنە هەروەکو پێغەمبەر عیسا علیه السلام، ئەوجا هەر کەس بەری بێت لەوەی خەڵک دەیپەرستێت یان بێ ئاگا بێ لێی ئەوا پێی ناوترێت طاغوت.

#پۆستی : (٤٥)

## طاغوت : (٢)

له قورئاندا الله تعالى به ئاشكرا به فيرعەون دەڵێت طاغوت، هەروەکو به پێغەمبەر موسای فەرموو: ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ (النازعات : ١٧)

:واته برۆ بۆ لای فیرعەون چونکە ئەو بەڕاستی له سنوور دەرچووه.

جا ئایا فیرعەون لەبەر ئەوەی خەڵکی کردبووه کۆیله و زوڵم و زۆری دەکرد بۆیه پێی وترا : طاغوت؟ با بزانین الله تعالى چی دەفەرموویت.

دەفەرموویت : ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ (٢٣) فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ (٢٤)(النازعات)

سنووردار : واته جادوگەرەکانی کۆکردەوه و هەموو خەڵکەکەی بانگ کرد، وتی من پەروەردگاری هەرە بەرزی ئێوەم.

کەواته زۆر ئاشکرایه که هۆی سەرەکی ئەوەی که پێی وتراوه طاغوت لەبەر ئەم قسانەی بووه، زۆری له خەڵکی کردووه که بیپەرستن، ڕێی گرتووه له پەیامی پێغەمبەر موسا، ئەوجا هەر کەس بیەوێت بپەرسترێت ئەوا طاغوت ـه.

هەروەها زانایانی تەفسیر به کەعبی کوڕی ئەشرەفیان وتوه طاغوت، که ئەم کەسه له سەرانی جولەکه بوو له سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، ئەم کەسه لەگەڵ حویەی کوڕی ئەخطەبی جولەکه ١٠ هەزار سەربازی عەرەبیان له ناو قورەیش و عەرەبه دەشتەکیەکان له پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان کۆ کردەوه تاکو ئیسلامی پێ لەناو بەرن ئەوه بوو شەڕی خەندەق ڕوویدا و الله تعالى ئیسلامی سەرخست.

هەروەها دڵنیابوو لەوەی که پەیامەکەی پێغەمبەر ﷺ حەقه بەڵام نەک بڕوای پێ نەدەکرد بەڵکو خەڵکی زیاتر بەرەو کوفر هاندەدا، هەروەکو الله تعالى دەفەرموویت : ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ (آل عمران : ٧١)

واته ئەی ئەهلی کتاب [واته جولەکەکان] بۆ حەق تێکەڵ به بەتاڵ دەکەن، واته سیفەتی دەجال تێکەڵ به سیفاتی محمد دەکەن وه بۆ حەق دەشارنەوه واته بۆ سیفاتی محمد ﷺ دەشارنەوه له کاتێکدا باش دەیزانن له کتێبەکەتاندا واته تەورات.

پاشان دەفەرموویت : ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ (آل عمران : ٧٢)

واته وه بەشێک له ئەهلی کیتاب که کەعب و هاوەڵانین له سەرانی جولەکه به خەڵکەکەیان وت ئیمان بهێنن بەوەی دابەزێنراوەته سەر ئیمانداران واته ئیمان بهێنن به محمد و به قورئان له بەیانیدا، پاشان له کۆتاییەکەی پێی کافر بن واته له نیوەڕۆدا بەڵکو به هۆی ئەوه بگەڕێنەوه.

مەبەستی ئەم طاغوتە ئەوە بوو کە بەیانیەکەی ئیمانی پێ بهێنن دواتر لە نیوەڕۆدا بگەڕێنەوە و بڵێن ئەم دینە درۆیە بەشکوم کەسانێک بە هۆی ئێوەوە لە دینەکەیان هەڵگەڕێنەوە کاتێک کە دەتان بینن هەڵگەڕاونەتەوە.

پاشان حەرامی بۆ خەڵک حەڵاڵ کردووە هەروەکو الله تعالى دەفەرمووێت : ( وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ) (آل عمران : ٧٥)

:واتە لە ئەهلی کیتاب کەسانێک هەن کە یەک تەپۆلکە ئاڵتونی بە ئەمانەت لەلا دابنێی بۆت دەگەڕێنێتەوە بەڵام هەندێکیشیان دینارێکی لەلا دابنێیت بۆت ناگەڕێنێتەوە و بۆ خۆی حەڵاڵی دەکا مەگەر خۆت پێداگر بیت لەسەر پارەکەت، کە ئەمەش مەبەستی کەعب و هاوەڵانێتی جا ئەم حەڵاڵ کردن و خیانەتەی ئەوەبوو کە وتی هیچ گوناهمان لەسەر نیە بە بردنی پارەی عەرەبەکان وە درۆ بۆ الله هەڵدەبەستن و دەشزانن کە درۆ دەکەن.

(بڕوانە تەفسیری ابن وهب)

ماویەتی

#پۆستی : (٤٦)

## طاغوت : (٣)

لە پۆستی پێشووتر باسمان کرد کە کەعبی کوڕی ئەشرەف حەڵاڵی حەڕام کردووە و حەڕامی حەڵاڵ کردووە هەروەها پێشتر لە زنجیرەی #شیرکی_گەورە لە پۆستی دووەم باسی شیرکی گوێڕایەڵیم کردبوو، لێرەش بە کورتی باسی دەکەمەوە بۆ ئەوەی ڕوونتر بێت:

الله تعالى دەفەرمووێت : (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ) (التوبة : ٣١)

:واتە گاور و جولەکە حاخام و قەشەکانی خۆیان کردە خوا لە غەیری الله، وە عیسای کوڕی مەریەمیشیان کردبووە خوا کەچی تەنیا فەرمانیان پێ کرابوو یەک خوا بپەرستن کە الله یە.

الطبري لە تەفسیرەکەیدا لە بارەی ئەم ئایەتەوە لە هاوەڵی بەڕێز عەدی کوڕی حاتەمەوە «الله لێی ڕازی بێ» دەگێڕێتەوە:

هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و خاچێکم لە ملدا بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم ئەی عەدی ئەو پەیکەرە لە ملت دابکەنە، عەدی فەرمووی : منیش لە ملم دامکەند و دواتر پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە «مەبەست لە ئایەتەکەی سەرەوەیە »

منیش وتم ئەی پێغەمبەری الله ئێمە حاخام و قەشەکانمان نەدەپەرست.

**فەرمووی : ئەی ئەوەیان بۆ حەرام نەدەکردن کە الله حەلاڵی کردبوو ئێوەش حەرامتان دەکرد؟ وە ئەوەیان حەلاڵ دەکرد کە الله حەرامی کردبوو ئێوەش حەلاڵتان دەکرد؟**

**وتم : بەڵێ.**

**فەرمووی: جا ئەوە پەرستنیانە.**

**کەواتە تێ بگە ڕەحمەتت لێبێت هەر کەس حەلاڵێکی ئاشکرای حەرام کرد یان حەرامێکی ئاشکرای حەلاڵکرد و خەڵکیش شوێنی کەوتن لە حەلاڵ کردن یان حەرامکردنی شتەکەدا ئەو کەسە دەپەرسترێت لەلایەن ئەوانەی شوێنی دەکەون، هەر کەسیش بپەرسترێت ئەوا بووەتە طاغوت مادام پێی ڕازیە.**

**ئەگەر جولەکە و گاور لەسەر ئەم کارەیان لای الله تعالی بوویتن بە طاغوت، ئەی پێت وانیە ئەوانەی ئەمڕۆ لە پەرلەمان شەریعەت بۆ خەڵک دادەنێن طاغوت نەبن؟ خۆ ئەوانیش حەلاڵی الله تعالی حەرام دەکەن و حەرامی الله تعالی حەلاڵ دەکەن، وە خەڵکیش بە دەنگدان پشتیان دەگرن و دەیان پەرستن و پشتیوانیان ئەکەن.**

**بۆیە ڕەحمەتت لێبێت بیر بکەرەوە و دەنگیان پێ مەدە و خۆت لە خۆیان و شوێنکەوتوانیان بەری بکە چونکە کوفر کردن بە طاغوت و ئیمان هێنان بە الله تعالی بەشێکە لە وەلاء و بەرائەکەت، بەبێ وەلاء و بەڕائیش لا إله الا الله کەت دانامەزرێت و موسڵمان نیت تا وەلاء و بەرائت نەبێت.**

**الله تعالی بە ڕاشکاوانە واجبی کردووە لەسەرت کە کوفر بە طاغوت بکەیت و ئیمان بە خۆی بهێنی، هەروەکو دەفەرمووێت :** ( فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا )**(البقرة : ٢٥٦)**

**هەر کەس کوفر بە طاغوت بکات و ئیمان بە الله بهێنێت ئەوا دەستی بە هۆکارێکی پتەو گرتووە کە پچڕانی بۆ نییە .**

**ابن وهب لە تەفسیرەکەی خۆی هێناویەتی کە ابن عباس لە تەفسیری ئەو هۆکارە قایمەدا دەڵێ : مەبەستی لا اله الا الله یە.**

**کەواتە ئیسلامت نییە بە بێ کوفر کردن بە طاغوت و ئیمان هێنان بە الله، چونکە ئەگەر وا نەکەیت دەستت نەگرتووە بەو هۆکارە قایمە کە لا اله الا الله یە، هەڵبەت کوفر کردن بە طاغوتیش بەوە دەبێت کە لە خۆیان و شوێن کەوتوانیشیان بەری بیت وە ڕێبازەکەشیان بە پووچ و بەتاڵ بزانی و بە کافریان بزانیت.**

**#پۆستی : (٤٧)**

## کوفر و شیرکی بچووک : (١)

**کوفر و شیرکی بچوک ئەوەیە کە بە ئەنجام دانی کافر نابێت و لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە هەروەها پێشی دەوترێت** (كُفرٌ دونَ كُفر**، یان شرک دون شرک)**

**لە زۆر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەبینی دەستەواژەی کوفر و شیرک بەکار هاتووە، یاخود ئەنجام دەرەکەی بەوە ناوبردووە کە لە ئەو نییە.**

**جا ئەمانە و زۆرێکی تریش زانایان لە کتێب و نامیلکەکانیان بۆ ئێمەیان نەقڵ کردووە کە کوفری گەورە نین بەڵکو گوناهانێکن کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر بکەرەکەی توند بووە بۆ ئەوەی ئوممەتەکەی لە گەورەیی ئەو گوناهانە هۆشیار بکاتەوە.**

**جا ئایا پێغەمبەر ﷺ لە وتنی دەستەواژەی کوفر مەبەستی کوفری گەورە بووە یان بچوک؟ چۆن بیناسینەوە ئێمە؟**

**تاکە ڕێگا بۆ ناسینەوەیان بریتیە لە گەڕانەوە بۆ زانایانی سەلەفی ئوممەت، چونکە ئەوان شارەزاترین کەس بوون بە کتێبی الله تعالى و فەرموودەکانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، چونکە ئەوان یان ئەوەتا هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوونە یان شوێن کەوتەی هاوەڵان بوون یان شوێنکەوتەی شوێن کەوتوان بوون، جا ئاشکرایە کە ئەوان لەسەر دینە ڕاستەقینەکە بوون و جوانتر لە قورئان و سوننەت تێگەیشتوون وەک لە ئێمە.**

**بەڵام بەداخەوە ئەبینی زۆرێک لە بانگخواز و مەلاکانی ئەمڕۆ کە ئەو مەنهەجەی زانایانی سەلەفی ئوممەتیان تەرک کردووە، لە وتار و وانەکانیاندا دەڵێن ئەوەی فلانە شت بکات کافر دەبێت! یاخود بمرێ الله بە بێ ئیمانی زیندووی دەکاتەوە! کەچی هەر ئەوەی کە ئەو خەڵکی لەسەر بە کافر دادەنێت زانایان بە کوفری بچوک دایان ناوە.**

**بۆیە ئێمەی موسڵمان نە دەبێت توندڕەو بین نە شلڕەو، تەنها شوێن کەوتنی دەقمان لەسەرە بە تێگەیشتنە ڕاستەقینەکەی سەلەف، جا ان شاء الله تعالى لە پۆستی داهاتوو چەند کوفر و شیرکێکی بچوک باس دەکەین.**

*#پۆستی : (٤٨)*

## کوفر و شیرکی بچووک : (٢)

**ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رحمة الله علیه لە نامیلکەی اصول السنة لە فەقەرەی النفاق و انتقاص الصحابة باسی نیفاق دەکات، پاشان چەند فەرموودەیەک دەهێنێ و ڕایدەگەیەنێت کە کوفری بچووکن، هەروەکو دەفەرمووێت:**

**فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : (سێ شت لە هەرکامێکتان هەبێت ئەوا ئەو کەسە موونافیقە) ئەمە لە ڕووی توندێتیەوەیە، بەو شێوەیە ڕیوایەتی دەکەین کە هاتووە و تەفسیری ناکەین، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : (لە دوای من مەبنەوە کافر کە هەندێکتان لە ملی هەندێکی ترتان بدەن)، وە هاوشێوەی ئەمە : (ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان گەشتن بە یەک ئەوا بکوژ و کوژراو هەردوکیان لە ئاگردان)، وە هاوشێوەی ئەمە :**

(جنێودان بە موسڵمان فسقە، وە شەڕ کردن لەگەڵی کوفرە)، وە هاوشێوەی ئەمە : (هەر کەس بە براکەی وت ئەی کافر، ئەوا بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە)، وە هاوشێوەی ئەمە : (کوفر کردن بە الله ئەوەیە کە خۆت بەری بکەی لە ڕەچەڵەکەکەت ئەگەر کەمیش بێت) وە نمونەی ئەم فەرموودانە کە صحیحن و لەبەرکراون، جا ئێمە تەسلیمیان دەبین تەنانەت ئەگەر تەفسیرەکەشی نەزانین، وە قسە و مناقشەی تێدا ناکەین، وە تەفسیری ئەم فەرموودانە ناکەین مەگەر بەو شێوەیە نەبێت کە هاتوونە، و ڕەتیشیان ناکەینەوە مەگەر بە شتێکی صحیح تر لەمانە.

جا بزانە ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت ئەمانە لە ڕووی توندیتیەوە هاتوون، واتە پێغەمبەر ﷺ توند بووە لەسەر ئەم گوناهە و بکەرەکەی نەک ئەوەی بڵێت ئەنجام دەرەکەی کافرە یان مونافیقە، هەروەها ئەمەی کە ئیمام ئەحمەد باسی کردووە لە زانایانی پێش خۆی وەری گرتووە نەک ئەوەی کە لە هەوا و ئارەزووەوە قسەی کردبێت.

فەرموودەی یەکەم کە باسی نیفاق دەکات درێژەکەی ئەوەیە کە دەفەرمووێت : (ئەگەر وەعدی دا دەیشکێنێت، وە ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، . . . ) لە شوێنێکی تر دەفەرمووێت : (ئەگەر ئەمانەتی پێ سپێردرا خیانەتی لێ دەکا، . . . )، ئەسڵەن نیفاقی بیروباوەڕ کە نیفاقی گەورەشی پێ دەوترێت ئەوەیە لە ژێرەوە کافر بێت و بە ڕووکەش ئیسلام نیشان بدەیت، ئێ کوا وەعد شکاندن و درۆکردن و ئەمانەت نەپاراستن کوفرن تا بڵێیت ئەوەی کە ئەم سیفەتانەی تێدا بێت مونافیقە؟ جا کەواتە ئەمە نیفاقی بیروباوەڕ نیە نیفاقی عەمەلە و ئەنجام دەرەکەی منافق نیە.

هەروەها کوشتن و جنێو دان و خۆ بەریکردن لە ڕەچەڵەک کوفری گەورە نین، ئەگەر بڵێیت شەڕکردن لەگەڵ موسوڵماندا کوفری گەورەن ئەوا مەجبوری بەشێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە کافر بزانی لە کاتێکدا کەسانی وایان تێدا بووە کە موژدەی بەهەشتی پێدراوە، چونکە ئەوانیش ناکۆکی و شەڕ لە نێوانیان هەبووە بەڵام ئێمە نەهیمان لێکراوە باسی ناکۆکی نێوانیان بکەین، وە بە کافردانانی ناحەقیش ئەوە نیە خۆتی پێ کافر بیبیتەوە بەڵکو تاوانی ئەو تەکفیرکردنە ناحەقەت دەکەوێتە سەر.

هەروەها لەم ڕووەوە فەرمودەی: (هەر کەس گزی لێمان کرد لە ئێمە نیە)، یان : (هەر کەس بە غەیری الله سوێندی خوارد ئەوا کوفر یان شیرکی کردووە) ئەمانە و زۆرێکی دیکە کوفری بچووکن بەڵام ئەگەر ئەم کارانەی لا حەڵاڵ بوو یان ئەو شتەی سوێندی پێ خوارد پێی گەورەتر یان یەکسان بوو بە الله، ئەوا پێی کافر دەبێت، والله تعالی اعلی و اعلم.

ان شاء الله لە داهاتوودا زیاتر لەبارەیەوە قسە دەکەین.

#پۆستی : (٤٩)

## تەکفیر : (١)

تەکفیر واتە بە کافر دانان، جا پێش ئەوەی بڕۆمە ناو بابەتەکەوە ئەمەوێت بڵێم ئەم بابەتە زۆر شێوێنراوە لە لای خەڵکی، زۆرینەی خەڵکی لە ئێستادا زۆر شلن لەم بابەتەدا بە شێوەیەک ئەگەر باسی تەکفیریان لا بکەیت یەکسەر بە توندڕەو و خەواریجت دەزانن، لەگەڵ ئەمەشدا کەسانێک هەن کە زۆر زیادەڕەوی تێدا دەکەن

و خەڵکی لەسەر شتانێکی زۆر سەیر بە کافر دادەنێن یاخود عامەی خەڵکی بە کافر دەزانن بێ ئەوەی هیچ کوفرێکیان لێیان دیتبێت.

کێشەی هەردوو لایەنەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە حیزبە بەناو ئیسلامیەکان و مەدخەلیەکان زۆر چەواشەیان لەم بابەتەدا کردووە، ئاخر تۆ چی چاوەڕێ دەکەیت لە ئەوان کە بابەتەکەت تێبگەیەنن لە کاتێکدا هێندە چەواشەکارن لە حیزبی بەناو ئیسلامیەکاندا تێدایە دەڵێت گاور و جولەکە کافر نین !!! بۆیە کۆمەڵێک بە قسەکانیان هەڵخەڵەتا و ئەوانی دیکەش لە ڕقی ئەم حیزبانە بابەتەکەیان زۆر بە توندی گرتووە.

یان وەکو مەدخەلیە جەهمیەکان هەزار و یەک مانعی تەکفیر دابنێیت هەتا کەسێکی کافر تەکفیر نەکەیت و بە موسوڵمانی بزانیت.

وە نابێت وەکو عمومیە گومراکان ئەو کەسانەشی کە نوێژ و ڕۆژوو و سیمای موسوڵمانێتیان لێ دەبینرێت بە کافریان بزانیت.

جا بەڕاستی موسڵمان دەبێت هۆشیار بێت و کوێرانە قسە نەکات یاخود هەست و سۆز بەسەریدا زاڵ نەبێت، بەڵکو دەبێت بە عیلم و دڵنیاییەوە قسە بکات و کردەوە بکات، نەک بە گومان.

وە موسڵمان نابێت شلڕەو بێت وە نابێت لە ڕقی شلڕەوەکان توندڕەو بێت، بەڵکو موسڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە شوێنی بەڵگە دەکەوێت و بە عیلمەوە دینداری دەکات بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت.

وە موسڵمان هەر کات حەقی بۆ ڕوون بووەوە و بەڵگەی نیشان درا بە تێگەیشتنی سەلەف واجبە شوێنی حەق بکەوێت جا گرنگ نییە ئاخۆ دە ساڵە لەسەر ناحەقە یاخود چەند ساتێکە بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە تەنها و تەنها شوێنی حەقەکە بکەوێت و لە ناحەقەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە.

جا إن شاء الله لە پۆستەکانی داهاتوودا دەچمە ناو بابەتەکەوە و هەوڵ دەدەم ڕوونی بکەمەوە، وە الله عز وجل ئاگاداری نیەتمانە کە مەبەستی من تەنیا ئەوەیە بابەتەکان وەکو خۆیان بگەیەنم، بۆیە داوای تەوفیق لە الله تعالى دەکەم کە یارمەتی ئێمە و ئێوەش بدا بۆ فێربوونی دینە ڕاستەقینەکەی کە بریتیە لە قورئان و فەرموودە بە تێگەیشتنی سەلەف.

#پۆستی : (٥٠)

## تەکفیر : (٢)

هەموو کەس دەزانێت دەستنوێژ بە شتانێک بەتاڵ دەبێتەوە، بۆ نمونە هەر شتێک لە پاش و پێشت هاتە دەرەوە ئەوا تۆ دەستنوێژت نەماوە، هەروەها نوێژیش کۆمەڵێک کردار بەتاڵی دەکاتەوە بۆ نمونە نەمانی دەستنوێژ لەناو نوێژەکەت یاخود خواردن و خواردنەوە لە ناو نوێژەکەت، بە هەمان شێوە کردەوەکانی تریش هەڵوەشێنەرەوەی خۆیان هەیە و ئەگەر ئەنجامیان بدەی ئەوا سفر دەبنەوە.

بۆ ئیسلامەتی و تەوحید یش هەڵوەشێنەرەوە هەیە، ئەویش بریتیە لە کوفر و شیرکی گەورە و نیفاق، بەڵام کوفر و شیرکی بچووک ئیسلامەتی پێ هەڵناوەشێتەوە.

**الله تعالى دەفەرموویت** : ( وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ )**(الزمر : ٦٥)**

**:واتە ئەی محمد ﷺ وەحی بۆ تۆ و ئەوانەی پێش تۆ نێردراوە کە ئەگەر شیرک ئەنجام بدەیت ئەوا هەموو کردەوەکانت بەتاڵ دەبنەوە و لە ڕۆژی دواییش لە دۆڕاوان دەبیت.**

**هەروەها دەفەرموویت** (وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ ) **(التوبة : )**

**:واتە وە بەڕاستی وشەی کوفریان وت و کافر بوونەوە دوای ئیسلامەتیان.**

**جا دیقەتی ئایەتەکان بدەن و تێڕابمێنن لە قورئان زۆر بە ئاشکرا ئەوەتان بۆ دەردەکەوێت کە ئیسلامەتیش هەڵدەوەشێتەوە، تەنانەت بۆ پێغەمبەرانیش قبوڵ نەبووە کە شیرک و کوفر ئەنجام بدەن کە هەرچەندە ئەوان نەک لە کوفر و شیرک بەڵکو لە تاوانی گەورەش مەعصوم بوونە بەڵام بۆ تێگەشتنی ئێمەیە کە الله تعالى وای فەرمووە.**

**جا ئەمەم وەکو بیرخستنەوەیەک باسکرد، ئێستە من ئەپرسم ئایا کەسێک لە نوێژدا دەستنوێژی نەمێنێت هێشتا پێی دەڵێی ئەم کەسە نوێژی کردووە؟**

**کەسێک بە ڕۆژووە بەڵام لە نیوەڕۆدا قومێک ئاو دەخوات، ئایا هێشتا ڕۆژووەکەی ماوە؟**

**بێگومان نەخێر، ئێ دەی ئیسلامەتیش زۆر لەوانە حەساسترە، کەسێک کە شیرکی ئەنجامدا دەزانی چی کردووە؟ وەکو ئەوەیە دروستکراوێکی بێ دەسەڵاتی الله ی یەکسان کردبێت بە الله ی عظیم!**

**هێشتا تۆی موسڵمان ئەم کەسە بە موسڵمان دەزانیت؟ مەگەر غیرەتت بۆ الله تعالى نییە؟**

**هەروەها کەسێک نکوڵی لە ئایەتێک دەکات یان گاڵتە بە ئادابێکی ئیسلامی دەکات یان جنێو بە الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدات یان هەر کوفرێکی تر لە کوفرە گەورەکان، تۆ هێشتا بە موسڵمانی دەزانیت؟! ئەگەر هەمان کەس جنێو بە ناموست بدا لێی قبوڵ ئەکەیت ؟**

**جا تۆ ئەگەر قبوڵت کرد دیارە غیرەتت نیە، بەڵام الله تعالى دەفەرموویت** : ( وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ **(الزمر : ٧)**

**:واتە ڕازی نییە کە بەندەکانی کوفر بکەن.**

**بەڵام دەبێت ئاگامان لەوەبێت کە ئێمە تەنیا بڕیار لەسەر ئەوە دەدەین کە دیومانە بە چاوی خۆمان، واتە کوفر لە کەسەکە نەبینین یاخود نەیبیستین بۆمان نییە گومانی ئەوەی پێ ببەین کە لە ناو دڵیدا چی دەگوزەرێت، تەنها و تەنها ڕووکەشمان لەسەرە و ئەوەی لە ناو دڵیشدا دەگوزەرێت دەیگێڕینەوە بۆ الله تعالى، جا إن شاء الله لە پۆستی داهاتوو ڕوونتری ئەکەینەوە.**

#پۆستی : (٥١)

## تەکفیر : (٣)

ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ سەرقاڵی خۆ ئامادەکردنە بۆ غەزای تەبووک چەند کەسێک گاڵتەی پێ دەکەن و دەڵێن : ئەم پیاوە زۆر سەیرە ئەیەوێ کۆشک و قەڵاکانی رۆم بگرێت !

جا الله عز وجل لە بارەیانەوە دەفەرموێت : (وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ) (التوبة : ٦٥)

:واتە ئەگەر لێت بپرسیایە دەیان وت تەنها بە گاڵتە و گەپ وامان وتوە و بە ڕاستمان نەبووە، ئەی محمد پێیان بڵێ گاڵتەتان بە الله و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکرد؟!!

لە ئایەتی دواتر دەفەرموێت ( لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ) (التوبة : ٦٦)

:واتە عوزر مەهێننەوە و مەڵێن بە گاڵتەمان بووە، بەڕاستی کافر بوونەوە لە دوای ئیمان هێنانتان، ئەگەر لە کۆمەڵێکتان ببورین لەبەر ئەوەیە کە پەشیمان بوونەتەوە ئەوە سزای هەندێکیتان دەدەین لەبەر ئەوەی کە تاوانکار بوون و بەردەوام بوون لەسەر کوفر و لێی پەشیمان نەبوونەوە.

لەم ئایەتەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کوفر بە گاڵتەوگەپیش هەر کوفرە، واتە بە گاڵتەوە کوفرێک بکەیت یان بۆ ئەوەی خەڵکی پێت پێ بکەنێت ئەوە کافر ئەبیت. هەروەها قسەی ئەوانەش پوچەڵ دەبێتەوە کە دەڵێن کابرا دەبێت خۆی بڵێ کافرم ئینجا کافر دەبێت، نەخێر ئەوەتا عوزر دەهێننەوە کە بە ڕاستیان نەبووە و هێشتا الله عز وجل پێیان دەفەرموێت کافر بوونەوە دوای ئیمان هێنانتان.

هەروەها قسەی ئەوانەش پوچەڵ دەبێتەوە کە دەڵێن : کاکە بە کەس مەڵێن کافر بەشکم الله رۆژێک هیدایەتی بدا و بگەڕێتەوە. لێرەدا الله عز وجل پێیان دەفەرموێت کافر بوونەوە دوای ئیمان هێنانتان، دواتر دەفەرموێت ئەگەر لە هەندێکتان ببورین لەبەر ئەوە بووە کە پەشیمان بونەتەوە، کەواتە دەردەکەوێت کە هەر کات لە کوفرەکەی پەشیمان بووەوە و هاتەوە ناو ئیسلام بە موسڵمانی دەزانیت و هەر کات کوفری کرد کافر دەبێتەوە دووبارە.

نەزانەکان ئەڵێن : (کاکە بە کەس مەڵێن کافر بەشکم الله رۆژێک هیدایەتی بدا و بگەڕێتەوە) ئەسڵەن ئەم قسەیە زۆر گێلانەیە، چونکە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان بە یەکجار موسڵمان نەبوون، هەیان بوو زوو موسڵمان بوو هەشیان بوو زۆر درەنگ موسڵمان بوو، بۆ نمونە عکرمەی کوڕی ابو جهل رضي الله عنه کە فەتحی مەککە دەکرێت ڕادەکا چونکە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، لەبەر ئەوەی هێندە کافرێکی سەرسەخت بووە بەڵام دواتر شایەتمان دەهێنێت و پێغەمبەریش ﷺ دەیبورێت

بۆیە تکایە مەڵێن بەشکم کابرا پەشیمان بێتەوە، ئێ هەر کاتێک پەشیمان بووەوە، دێتەوە ناو ئیسلام.

هەروەها کەسانێکیش دەڵێن بەشکم نەیزانیبێت کوفرە بۆیە ئەنجامیداوە!

ئاخر تۆ کە دێیتە ناو ئیسلامەوە لەسەر ئەو ئەساسە دێیتە ناوی کە خۆت لە کوفر و شیرک دارنیت، وە ئەم کوفرانەی کە باسمان کردوون هەمووی کوفری ئاشکران و هەموو کەس دەبێت بیزانێت، ئێستە چ مەعقولیەتێکی تێدایە بڵێی لا إله إلا الله کەچی هاوار لە غەیری الله بکەیت؟! یان بڵێی ئێستە فلانە ئایەت ناگونجێ لەگەڵ سەردەم؟! یان بچی پەنجە بۆ کەسانێک مۆر بکەی کە ئیسلام بە وەحشیگەری دەزانن؟! یان پەنجە بۆ کەسانێک مۆر بکەیت کە دەڵێن کرۆکی دیموکراسیەت لە ئیسلامەوە وەرگیراوە،ئەگەر ئەم کارانە بکەیت ئەوە تۆ ئەسڵەن لە ئیسلام تێنەگەیشتوویت هەتا بە خۆت بڵێیت موسوڵمان.

نەزانین لە هەندێ کاتدا عوزرە کە کەسانێک بە فێڵەوە کوفر دەربڕن و کەسانێکی نەزانیش بێن دووبارەی بکەنەوە بێ ئەوەی بزانن واتای چیە، جا لە هەندێک حاڵەتدا ئەم نەزانانە ڕاستەوخۆ تەکفیر ناکرێن بەڵکو فێر دەکرێن کە ئەم شتە کوفرە ئەگەر هەر وازیان لێ نەهێنا ئەو کات تەکفیر دەکرێن.

#پۆستی : (٥٢)

## تەکفیر : (٤)

هەروەکو پێشتریش وتمان؛ تەکفیرکردن لەسەر ڕووکەش و دڵنیایی دەکرێت، واتە دەبێت کوفرەکە لە کەسە ببینرابێت یان بیسترابێت و لێی دڵنیابیت کە کردویەتی ئینجا تەکفیر دەکرێت، نەک لە خۆتەوە گومانی خراپی پێ ببەیت، چونکە تەنیا الله تعالی ئاگای لە دڵە ئێمە تەنیا ڕووکەشمان لەسەرە.

بۆیە هەر کەس شایەتمانی هێنا و نوێژی کرد و ڕۆژووی گرت یاخود هەر شەعائیرێکی ئیسلامی لێ بینرا و کوفری لێ نەبینرابوو ئەوا دەبێت بە موسڵمانی بزانیت، بەڵگەش ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ناوی هەموو مونافیقەکانی بە وەحی پێ ڕاگەیەندرابوو بەڵام مونافیقەکان کوفرەکەیان شاردبووەوە و لە ڕووکەشدا ئیسلامیان نیشان دەدا بۆیە پێغەمبەر ﷺ تەکفیری نەکردن بەئاشکرا.

بەڵام کاتێک کوفریان ئاشکرا کرد لە غەزای تەبوکدا، الله تعالی فەرمووی : ( لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ) (التوبة : ٦٦)

:واتە عوزر مەهێننەوە چونکە کافر بوونەوە لە دوای ئیمان هێنانتان.

هەروەها لە فەرموودەیەکی متفق علیه هاتووە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە رضي الله عنه فەرمووی : ﷺ ناردینی بۆ جوهەینە، جا گەیشتینە لای ئاوەکانیان، وە من و ئەنصاریەک شوێنی پیاوێک لەوان کەوتین، جا کە گرتمان پیاوەکە وتی : لا إله إلا الله، بۆیە ئەنصاریەکە دەستی لێ هەڵگرت بەڵام من ڕمێکم لێدا و کوشتم، جا کە گەیشتینەوە مەدینە، ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ بۆیە پێی فەرموووم : (ئەی ئوسامە! کوشتت دوای ئەوەی کە وتی لا إله إلا الله)

وتم : ئەی پێغەمبەری الله بۆ پەناداني خۆی وای وت.

دوبارە فەرمووی : (کوشتت دوای ئەوەی کە وتیشی لا إله إلا الله؟) جا هەر دووبارەی دەکردەوە تا ئەوەی کە هیوام دەخواست ئەو ڕۆژە موسڵمان بووومایە.

متفق عليه

جا حزبە بەناو ئیسلامیەکان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بیانوی ئەوەی کە نابێت بە کەس بوترێت کافر، ئێ باشە ئێمەش دەڵێین هەر کەس وتی لا إله إلا الله و کوفری لێ نەبینرا موسڵمانە بەڵام کە کوفری ئەنجامدا ئیسلامەتیەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە الله تعالی فەرموویەتی : ( لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ) (الزمر : ٦٥)

:واتە ئەگەر شیرکت کرد هەموو کردەوەکانت بەتاڵ دەبێتەوە.

دواتر ئەگەر وتیان تەکفیر کردن ئیشی خەواریجەکانە ئەوا درۆ دەکەن، چونکە خەواریجەکان بە ناحەق خەڵکیان تەکفیر دەکرد واتە بێ ئەوەی کەسەکە کوفری کردبێت تەکفیریان دەکرد، خۆ بەشێک لە هاوەڵانی وەکو ابن عباس و ابن عمر تەکفیری کۆمەڵەیەکیان کرد کە پێیان دەوترا قەدەریەکان، وە إن شاء الله لە داهاتوودا زیاتر دەچمە ناو ئەو بابەتانەوە بەڵام با لێرەدا باسکردنی تەکفیر بەس بێت.

لە ئێستادا تەنیا بزانن کوفر و شیرکی گەورە چیە سەرەتا بۆ ئەوەی خۆتانی لێ بپارێزن دواتر تاکو دەور و بەرتانی لێ ئاگادار بکەنەوە، جا ئەگەر هەر کەسیش ئەنجامیدا خۆتانی لێ بەری بکەن و تەکفیری بکەن.

#پۆستی : (٥٣)

## بیدعە : (١)

بیدعە واتە داهێنان، کردەوەیەکە هەمیشە پێچەوانەی سوننەتە، وە ناو نراوە (بدعَة) لەبەر ئەوەی کە ئەنجامدەرەکەی دای هێناوە بەبێ ئەوەی کە هیچ پێشەوایەکی هەبێت.

جا بیدعە ئەو کردەوەیەیە یان ئەو وتەیەیە کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی نەیان کردووە و نەیان وتووە، وە زانایانیش لە تابعین و ئەتباعی تابعینیش لەسەری نەبوونە چونکە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەری نییە

زانایان لە هاوەڵان و تابعین لە دوای کوفر و ئەهلی کوفر زۆر توند بوونە لەسەر بیدعە و ئەهلەکەی، وە بیدعەیان بە گەورەترین تاوان داناوە لە دوای کوفر، چونکە بیدعە لە تاوانەکانی وەکو کوشتن و زینا و دزی هتد ناچێت کە خاوەنی ئەم جۆرە تاوانانە خۆیان بە تاوانبار دەزانن بۆیە لەوانەیە زۆر ئاسانتر تەوبەی لێ بکەن، ئەگەر چیش گوێی نەداتێ کە تاوانێکی گەورەی کردووە بەڵام لە ناخی خۆی هەر هەست بە تاوان دەکات.

بەڵام بیدعە زۆر جیاوازە؛ خاوەن بیدعە ئەو کارە یان ئەو وتەیەی کە دایهێناوە بە شتێکی خێری دەزانێت، واتە وا هەست دەکات کە کارێکی چاکی کردووە، ئێ ئەگەر کەسێک وابزانێت کاری چاک دەکا چۆن تەوبەی لێ دەکات؟!

ورد ببنەوە لەم وتەیەی ئیمامی الأوزاعي کە زیاتر ڕوونی دەکاتەوە، الأوزاعي دەفەرمووێت :

ئیبلیس بە دۆستەکانی وت : لە کوێوە دەچن بۆ نەوەی ئادەم؟

وتیان : لە هەموو شوێنێکەوە.

**وتی : ئەی لە ڕێی داوای لێخۆشبوونیانەوە بۆیان دەچن؟**

**وتیان : ئەوە شتێکە کە بە ئێمە ناکرێت چونکە ئەوان دامەزراون لەسەر تەوحید.**

**وتی : دەبێت لە دەرگایەکەوە بۆیان بچم کە داوای لێخۆش بوون نەکەن لە الله.**

**الأوزاعي فەرمووی : جا هەواو ئارەزوو و بیدعەی تێدا بڵاو کردنەوە.**

**بڕوانە کتێبی الإبانة الصغری : ئەثەری ژمارە ١٠١**

**جا بیدعە تاوانێکە کە کەسی بیدعەچی بە تاوانی نازانێت، کە بە تاوانیش نەزانی چۆن تەوبەی لێ دەکات؟! بۆیە لەبەر ئەم هۆیە و چەندانی تر زانایان زۆر توند بوونە بەرامبەر بیدعە و ئەهلەکەی و لە بەرامبەر ڕق لێبونەوەیان چاوەڕێی پاداشتیش بوونە لە الله عز وجل.**

**بڕواننە ئەم وتانەی نەقڵی دەکەم سەبارەت بە ئەهلی بیدعە:**

**حمادی کوڕی زید فەرمووی : یونسی کوڕی عبید پێی وتم : ئەی حماد من گەنج ببینم لە هەموو حاڵەتێکی تاوان ئەوا لە خێری بێ ئومێد نابم، تاکو نەیبینم هاوڕێیەتی خاوەن بیدعەیەک دەکا، جا ئەو کات دەزانم کە تیاچووە.**

**یوسفی کوڕی أسباط فەرمووی : سەیرکردنی خاوەن بیدعە نوری حەق لە دڵدا دەکوژێنێتەوە.**

**بشری کوڕی الحارث فەرمووی : ئەگەر لەسەر ڕێگاکەت خاوەن بیدعەیەک هەبوو ئەوا چاوت بنوقێنە پێش ئەوەی پێی بگەیت.**

**بڕوانە کتێبی الإبانة الصغری : ئەثەری ٩٨ - ١٢٥ - ١٢٦**

**وتەی تر زۆرە لەسەر بیدعە و ئەهلەکەی، ئەمە تەنیا وەکو ناساندنێکی بیدعە و توندی تاوانەکەی بە گشتی، چونکە بەداخەوە ئەوەی ئەمڕۆ گوێی پێ نەدرێت بیدعەیە، لە پێشتر باسمان کرد کە تۆ دەڵێی أشهد ان محمدا رسول الله چوار شت لە خۆ دەگرێت چوارەمیان ئەوەبوو کە عیبادەت نەکەین مەگەر بەو شێوەیە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی واتە لە خۆمانەوە شت دانەهێنین و نەیکەین بە دین.**

**إن شاء الله لە پۆستێکی تردا ڕوونتری ئەکەینەوە.**

**#پۆستی : (٥٤)**

# بیدعه : (٢)

پێغەمبەر ﷺ کە دەستی بکردایە بە وتار خوێندن سەرەتا دەیفەرموو : (إن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار)

واته : ڕاستترین فەرموودە کتێبی الله یە، وە باشترین ڕێنمونی ڕێنمونی محمد ـە ﷺ، وە خراپترینی کاروبارەکان داهێنراو و تازەکانیەتی، وە هەموو داهێنراوێک بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەک گومڕاییە، و هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگری دۆزەخدایە.

سنن النسائي، بەرگی سێیەم، فەرمودەی ژمارە ١٨٨

یاخود دەفەرمووێت : (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو رد. )

واته : هەر کەس کردەوەیەکی کرد و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبوو ئەوا ڕەت دەکرێتەوە.

صحیحی مسلم، فەرموودەی ژمارە ١٧١٨.

بڕوانن پێغەمبەر ﷺ بیدعەی هەموو بە گومڕایی ناوبرد، بەڵام زۆرێک لە گومڕاکان ئەڵێن : کە دەفەرمووێت گومڕاییە مەبەستی لە بیدعەی خراپە نەک بیدعەی باش!!

بەم قسەیە هەرچی بیدعە و گومڕاییانە شەرعاندویانە بۆ خۆیان، ئاخر بەس بزانم کێ تا ئێستە بیدعەیەکی داهێناوە و بە خراپیشی زانیبێت؟! وە لە جیاکردنەوەی بیدعەدا بۆ باش و خراپ هیچ ئیمامێکیان نییە، واتە هیچ کەس لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان نەیان وتوە بیدعەی باش هەیە و خراپیش هەیە بەڵکو هەمیشە لەسەر بیدعە و ئەهلەکەی توند بوونە، باشە ئەگەر بیدعەی خراپ و باش هەبێت چ شتێک پێوەرە بۆ پۆلێنکردنی ئەم بیدعەیانە بۆ باش و خراپ، ئەگەر تۆ بیدعەیەک دابهێنیت و بڵێیت بیدعەی چاکە و فڵانە کەسیش بیدعەیەک دابهێنێت بڵێ چاکە و فڵانی تر و فیساری تر بیدعە دابهێنن ئەوکات چ شتێک لە دینە ڕاستیەکە ئەمێنێتەوە؟ چ شتێک ئەمێنێتەوە لەو دینەی کە رسول الله ﷺ هێناویەتی؟!

ئەم دینە دینی الله تعالى یە و بەرنامەیەکی جوانە بۆ مرۆڤەکان دایناوە، هیچ پێویست ناکات جەنابت پێی شتی بۆ زیاد بکەیت، ئەوەی کە بۆت دانراوە وەکو خۆی شوێنی بکەوە و تەواو، ئەگەر خێرێک لە بیدعەدا هەبوایە ئەوا هاوەڵان دەیان کرد کە لە هەموو کەس زیاتر لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ تێگەیشتبوون، بەڵام هەمیشە خۆیان لە داهێنان پاراستوە و فەرمانیان بە شوێنکەوتن کردووە.

هەروەکو عبدالله ی کوڕی مسعود کە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ دەفەرمووێت : (اتبعوا ولا تبتدعوا فقد كفيتم، فإن كل محدثة بدعة، و كل بدعة ضلالة. )

واته : شوێن بکەون و بیدعە مەکەن بەڕاستی ئەوەندە بەسە بۆتان، چونکە هەموو داهێنراوێک بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەک گومڕاییە.

الإبانة الصغرى، ئەثەری ژمارە ١٠٧

جا گومڕاكان بۆ ئەوەی خۆیان لە مەسەلەكە بدزنەوە دەڵێن : تۆ بە سواری وڵاخ هاتوچۆ بكە چونكە سەیارە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەبووە! یان ئەڵێن : كارەبا بەكارمەهێنە چونكە لەو سەردەمە نەبووە . . . تەنیا بۆ شەرعاندنی بیدعەكانیان ئەم قسانە و چەندین قسەی بێ مەعنای تر دەكەن كە بەڕاستی ئینسانی عاقڵ نایكات.

وا دەزانێت بەم قسانە دەمكوتت ئەكات، ئێمە باسی داهێنان لە دونیا ناكەین باسی داهێنان لە دینی الله عز وجل دەكەین، ئەمە دوو شتی جیاوازن، كەس ڕێی لێ نەگرتوی لە دونیادا داهێنان بكەی بەڵام دین جیاوازە الله عز وجل بۆ بەندەكانی داناوە و كەس بۆی نییە لێی زیاد و كەم بكات.

هیوادارم جارێ ئەوەندە بەس بێت لەسەر بیدعە، ان شاء الله لەمەودوا هەوڵ ئەدەین عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەتتان پێ بناسێنین، و بالله التوفيق.

#پۆستی : (٥٥)

## ئایا وتەكانی پێغەمبەر ﷺ و زانایان هەڵبەستراون؟

وتمان كە إن شاء الله لەمەودوا باسی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەكەین، بەڵام پێش ئەوەی باسی بكەم، بیرم كردەوە كە ئەو عەقیدەیە - عەقیدە واتە بیروباوەڕ - هەرچەندە قورئانی تێدایە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و وتەی زانایانیشی تێدایە، وە وتەی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەش لە قورئان و فەرموودەوە وەرگیراوە.

زۆربەی خەڵكی ئەم سەردەمەش هەر فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ یان وتەیەكی زانایان لەگەڵ بیر و بۆچوون و عەقڵی خۆی نەگونجێت یەكسەر دەڵێت : كورە بابە بەس قورئان وەكو خۆی ماوەتەوە، فەرموودە و وتە هەمووی هەڵبەستراون، چۆن ١٤٠٠ ساڵ وەكو خۆی بە هەڵنەبەستراوی ئەمێنێتەوە!!
فەرموودە و وتەی زانایان لە ئیسلامدا دەبێت سەنەدی هەبێت و سەنەدەكەشی صحیح بێت بەڵام ئەو كەسانەی كە ئەم قسەیە دەكەن هەر هیچ لە عیلمی فەرموودە نازانن تا بڕیار بدەن كە گوایە چ فەرموودەیەك هەڵبەستراوە یان نا، ئەم دینە بە سەنەد گەیشتووە بە دەستی ئێمە و هۆكارێكە كە وەكو خۆی ماوەتەوە تا ڕاست و ناڕاست لە یەكتر جیا بكەینەوە، هەروەكو پێشەوا سوفیانی ثەوری (١٦١ هـ) دەفەرمووێت:

(سەنەد چەكی ئیماندارە، جا ئەگەر چەكی پێنەبێت چۆن دەجەنگێت؟)!

ذم الكلام وأهله للهروي : ٩٠٤

خۆ ئەگەر بە قسەی ئەوان بێت و فەرموودە هەمووی هەڵبەسترابێت ئەوا نوێژ و خۆپاككردنەوە و غوسڵ دەركردن و هەموو حوكمەكان هەڵدەوەشێنەوە و شەرع بوونی نامێنێت، بڕواننە ئەم وتەیە:

لای عیمرانی كوڕی حوصەین كە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ باسی فەرموودە كرا و پیاوێكیش وتی : ئەگەر ئایەتێكتان لە قورئان بخوێندایەتەوە باشتر بوو لەو فەرموودەیە!

عیمرانیش پێی فەرموو : تۆ گەمژەیت، ئایا نوێژ بە تەفسیرکراوی ئەبینی لە قورئاندا؟، ئایا زەکات بە تەفسیرکراوی دەبینی لە قورئاندا؟ قورئان حوکمەکەی دەدا، وە سوننەتیش تەفسیری دەکات.

## الإبانة الصغرى : ٧٢

مەبەستی عیمران رضي الله عنه ئەوە بوو کە الله عز وجل لە قورئاندا فەرموویەتی نوێژ بکەن و زەکات بدەن، بەڵام ئایا فەرموویەتی نوێژەکان چەند رکعەتن؟ فەرموویەتی نوێژ و دەستنوێژ بە چی بەتاڵ دەبنەوە؟ فەرموویەتی لە نوێژەکانتان چی بخوێنن؟ یان بۆ زەکات، ئایا فەرموویەتی کە بڕی زەکاتەکە چەندە؟

نەخێر، بەڵکو چۆنیەتی نوێژ و زەکات و حوکمەکانی تر هەر لە فەرموودەی رسول الله ﷺ و وتەی هاوەڵاندا هاتووە، کەواتە ئەگەر هەمووی هەڵبەسترا بێت ئەوا ئەم حوکمانەش هەمووی هەڵدەوەشێنەوە و شەرعیش بوونی نامێنێت.

بۆیە ئەگەر نازانی فەرموودەیەک صحیحە یان نا ئەوا بە بیر و بۆچوونی خۆت بڕیاری لەسەر مەدە، و بزانە زانایانی فەرموودە لە سەلەف چیان وتوە سەبارەت بەو فەرموودەیە چونکە ئەوان ئەهلی ئەوەن کە هەڵبەستراو و هەڵنەبەستراو لە یەکتر جیا بکەنەوە نەک من و تۆی نەزان.

داواکارم لە الله تعالی کە ڕێگا ڕاستیەکە پیشانی هەموومان بدات.

#پۆستی : (٥٦)

## دین لە کێ فێربین؟

ئایا لە کێ ـوە فێری دین ببین؟ یان لە کوێ بە دوای دیندا بگەڕێین تاکو بگەین بە ڕێگا ڕاستیەکە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە زۆر گرنگە چونکە موسڵمان دەبێت دڵنیا بێتەوە لەوەی کە ئەو ڕێگایەی لەسەریەتی ڕێگا ڕاستەکەیە.

ڕێگا دروستەکە بۆ فێربوونی دین ئەوەیە بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕێگایەی کە سەلەفی صاڵح لەسەری بوون، ئەوان چیان وتبوو ئێمەش ئەوە بڵێینەوە.

لەوانەشە بە بیستنی وشەی (سەلەف) یەکسەر مێشکت بڕوا بۆ ئەو جەماعەتەی کە خۆیان ناو ناوە سەلەفی لە ئێستادا، بەڵام ئەو بیرکردنەوەیەت هەڵەیە.

سەلەف وشەیەکی عەرەبیە و بە واتای پێشین دێت وە صالحیش بە واتای چاک دێت، جا سەلەفی صاڵح (السلف الصالح) واتە (پێشینی چاک)، کە پێشینی چاکی ئەم ئوممەتە بریتی بوون لە : هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و تابعین وە ئەتباعی تابعین.

بەڕاستی ئەو ڕێگایەی ئەوان لەسەری بوون ڕێگا ڕاستیەکە بووە و هەر لەو سەردەمەی ئەواندا بووە کە ڕێیان نەداوە بیدعە و گومڕایی بڵاو ببێتەوە، گەر بڵاویش بووبێتەوە ئاگاداریان لێی داوە و بە توندترین شێوە ڕووبەڕووی بیدعە و ئەهلەکەی بوونەتەوە، هەروەها بیروباوەڕی خۆیان بۆ ئەوانەی پاش خۆشیان ڕوون کردووەتەوە.

وە ئەوان باشترین جیلی ئەم ئوممەتە بوون هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. )

واتە : باشترینتان ئەوانەی سەردەمی منن، پاشان ئەوانەن کە بە دوایاندا دێن، پاشان ئەوانەن کە بە دوایاندا دێن.

عیمرانی کوڕی حوصەین ئەو کەسەیە کە فەرموودەکەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، دەفەرمووێت : نازانم باسی دوو سەردەمی کرد یاخود سێ دانە لە دوای سەردەمەکەی خۆی.

**صحيح البخاري، فەرموودەی ژمارە ٦٦٩٥**

جا بە ڕاستی موسڵمان دەبێت بە شێوازێکی مەنهەجی دینداری بکا و باشترین مەنهەجیش مەنهەجی سەلەفە، إن شاء الله لە پۆستێکی تردا زیاتر باسی سەلەفی صالح دەکەین.

پۆستی : (٥٧)

## سەلەفی صاڵح کێن؟ : (١)

باسمان کرد کە سەلەفی صالح بە واتای پێشینی چاک دێت، هەروەها ئەو فەرموودەیەشمان هێنا کە پێغەمبەر ﷺ بە باشترین جیلی ئوممەت وەصفیان دەکات، هەروەکو دەفەرمووێت:

باشترینتان ئەوانەی سەردەمی منن، پاشان ئەوانەی کە بە دوایاندا دێن، پاشان ئەوانەی کە بە دوایاندا دێن.

صحيح البخاري : ٦٦٥٩

لەم فەرموودە صحیحەوە دەردەکەوێت کە باشترین جیل ئەوانەن کە پێغەمبەریان ﷺ دیوە، کە پێیان دەوترێت هاوەڵان (الصحابة ) الله تعالى فەزڵی بینینی پێغەمبەری ﷺ پێداون، الله عز وجل لە هەموویان ڕازی بێت، بەڵام هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەریان دیوە بە هاوەڵی هەژمار ناکرێن؛ بەڵکو ئەوانەی کە دیویانە و باوەڕیان پێی هێناوە و لەسەر ئیمان بەردەوام بوون تا مردن بە هاوەڵ هەژمار دەکرێن، بۆ نمونە ابو جهل پێغەمبەری ﷺ دیوە بەڵام باوەڕی پێی نەهێناوە ئەوا هاوەڵی نیە و کافرە.

وە دووەم جیل ئەوانەن کە پێغەمبەریان ﷺ نەدیوە، بەڵام هاوەڵەکانیان دیوە و گەیشتوون پێیان و لای ئەوان فێری عیلمی شەرعی بوونە؛ ئەم جیلە پێیان دەوترێ تابعین واتە شوێن کەوتوان کە باشترین جیل بوون لە دوای هاوەڵانەوە.

وە سێیەمیان پێیان دەوترێت ئەتباعی تابعین واتە شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان، کە ئەمانیش لە دوای تابعین باشترین جیلن، جا هەتاوەکو نزیک ساڵی ٣٠٠ ـەکانی کۆچی هەر بە سەلەفی صالح حسابە.

بەڕاستی سەلەف باشترینی ئوممەت بوون، زۆرترین عیلم و دونیانەویستی و عیبادەت و لە الله ترسان و تێگەیشتنیان هەبوو، هەر بیدعە و گومڕاییەک دەرکەوتبێت ئەوا زوو خەڵکیان لێ ئاگادار کردووەتەوە و بە توندترین شێوە ڕووبەڕووی گومڕایی و بیدعە بوونەتەوە، جا الله عز وجل بە هۆی ئەمانەوە دینەکەی خۆی

پاراستووه، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت لە دوای سەلەف کەس باش نەبوبێت؛ نا کەسی باش لە هەموو سەردەمێک هەیە بەڵام چاکترینی ئوممەت سەلەفە، وە پاش ئەوان ئەوانەی کە بە تێگەیشتنی سەلەف دینداری ئەکەن.

إن شاء الله لە پۆستی داهاتوو هەوڵ ئەدەین ناوی کەسایەتیە دیارەکانی سەلەفتان پێ بڵێین لەگەڵ ساڵی وەفات کردنیان.

پۆستی : (٥٨)

## سەلەفی صاڵح کێن؟ : (٢)

لەمەودوا لە باس کردنی هاوەڵان، لەوانەیە زیاتر ئەو هاوەڵانە باس بکەین کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هەر لە ژیان ماون نەک ئەوانەی پێش خۆی وەفاتیان کردووە، چونکە ئەوانەی دواتر دینیان نەقڵ کردووە بۆ تابعین و تابعینیش بۆ ئەتباعی تابعین.

هاوەڵان زۆرن ناودارترینیان ئەمانەن : ابو بکر و عومەر و عثمان و عەلی، هەروەها زوبەیر و ابو عوبەیدە و سەعدی کوڕی ابو وقاص و طلحە و زۆرێکی تر؛ بەڵام ئەوانەی کە ئێمە لەوانەیە زیاتر ناویان بێنین عبدالله کانن : عبدالله ی کوڕی مسعود، عبدالله ی کوڕی عباس، عبدالله ی کوڕی زوبەیر، عبدالله ی کوڕی عومەر، عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص، چونکە ئەمان جگە لە ابن مسعود زیاتر ژیاون لە ناو تابعین و زیاتر باس دەکرێن، جا بۆ ئەوەی ناوی زانایەکمان هێنا ئێوە بیناسنەوە کە لە هاوەڵانە ئەوا لە تەنیشتی ناوەکەی دەنوسین (رضي الله عنه)

دیارترین کەسایەتیاکان لە تابعین بریتین لە : عومەری کوڕی عبدالعزیز، سەعیدی کوڕی موسەیەب، سەعیدی کوڕی جوبەیر، حەسەنی بەصری، قتادة، عكرمة، طاووس، یونسی کوڕی عوبەید، السدي، إبن عون، أيوب السختياني، حسن البصري، مجاهد بن جبر، علقمة، إبراهيم النخعي، مسروق و زۆرێکی تریش.

وە دیارترین کەسایەتیەکان لە ئەتباعی تابعین : مالک بن أنس، ليث بن سعد، الأوزاعي، سوفیانی ثەوری، سوفیانی کوڕی عویەینە، عبدالله ی کوڕی المبارک، یحیی کوڕی سعید القطان، وە زۆرێکی تر.

وە دواتر دیارترینی زاناکان بریتین لە ئیمامی الشافعي و ئیمامی حومەیدی و ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، لەگەڵ صالح و عبدالله ی کوڕی، هەروەها هاوەڵاکانی وەکو ابو بکر المروذي، و عبدالله ی کوڕی هانئ، حرب ی کوڕی اسماعیل و هەروەها ابو بکر الخلال و الاجري و بەربەهاری و ابن بطة و زۆرێکی تر، وە هاوەڵەکانی ئیمامی الشافعي وەکو المزني و البويطي و سليمان بن حرب، وە زانایانی تر وەکو يحيي بن معين و أبو عبيد القاسم بن سلام و علي بن المديني لە پاڵ ئەوەشدا لە خۆراسان زانای گەورەی زۆری لێبووە وەکو ئیسحاقی کوڕی راهويه و محمدی کوڕی اسماعيل ناسراو بە ئیمام بوخاری کە خاوەنی صحیحی بوخاریە، محمدی کوڕی یحیی الذهلي و موسلیمی کوڕی حەججاج خاوەنی صحیحی موسلیم و النسائي و إبن خزيمة و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و إبن سريج و الدارقطني و چەندانی تر.

جا إن شاء الله کە ناوی زانایەکمان هێنا لە پاڵ ناوەکەیدا ساڵی وەفات کردنەکەی دەنوسین، بۆ نمونە ئیمام احمد ساڵی ٢٤١ ی کۆچی وەفاتی کردووە، دەنوسین : ئیمام احمد (٢٤١ هـ. )

## بۆچی پێویستە شوێنی سەلەف بکەوین لە تێگەیشتنمان بۆ دین؟ : (١)

**زۆرێک لە ئایەت و فەرموودەکان بە ڕاشکاوی جەخت لەسەر شوێنکەوتنی سەلەف دەکەنەوە، جا ئێمە لێرە چەند ئایەت و فەرموودەیەک دەهێنین.**

**الله تعالى دەفەرمووێت :** ( وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ) **(التوبة : ١٠٠)**

**واتە : وە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچەران و پشتیوانان، وە ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون الله لێیان ڕازییە، ئەوانیش لە الله ڕازین، وە بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.**

**بڕوانن الله عز وجل لە کێ ڕازییە؟ یەکەمجار ناوی هاوەڵانی بە پێشەنگ هێنا کە کۆچەران و پشتیوانان دەگرێتەوە، هەڵبەتە کۆچەران ئەو هاوەڵانەن کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە و پشتیوانانیش ئەوانەن کە لە مەدینە بوون و جێیان بۆ کۆچەران کردەوە و پێشوازیان لێ کردن بە چاکترین پێشوازی، جا ئەمان باشترینی ئوممەتن، دواتر الله عز وجل لەوانە ڕازیە کە بە چاکی شوێنی هاوەڵان دەکەون هەروەکو لە ئایەتەکە دیارە، بێگومان ئەم شوێنکەوتنەش لە هەموو شتێکدایە نەک ئەوەی کە شتێکت بە دڵ نەبوو بڵێی ڕای خۆی بووە و هەڵەیە، ئەگەر هەڵە بووبێ الله عز وجل بۆی ڕاست کردووەتەوە و هاوەڵانی تر جیاواز بوونە لەو.**

**یان الله تعالى دەفەرمووێت :** ( فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيم) **(البقرة : ١٣٧)**

**واتە : ئەگەر ئیمانیان هێنا بەو شێوەیەی کە ئێوە ئیمانتان هێنا ئەوا هیدایەت دراو دەبن، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوانە تەنها لە جیاوازی و ناکۆکین لەگەڵت الله بەسیانە کە بیسەر و زانایە .**

**ئەم ئایەتە بە ئاشکرا پێمان دەڵێت کە دەبێ بیروباوەڕمان وەکو هاوەڵان بێ ئەو کات ئێمە هیدایەت دراو دەبین، نەوەکو بەم کەمە عەرەبییەی خۆمانەوە بە ناو قورئان و فەرموودە بکەوین بە تێگەیشتنێکی نادروست لێی بڕوانین و بیروباوەڕێک دابمەزرێنین بە پێی تێگەشتنی خۆمان.**

**هەروەها الله جل جلاله دەفەرمووێت :** ( وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا )**(النساء : ١١٥)**

**وە هەر کەسێک دژایەتی پێغەمبەر ﷺ بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە و شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێت بێجگە لە ڕێگەی بڕواداران ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کە هەڵی بژاردووە و دەیخەینە دۆزەخ ئای چ پاشە ڕۆژێکی خراپە.**

**لە پۆستی داهاتوو ان شاء الله تعالى فەرموودەکان دائەنێین.**

#پۆستی : (٦٠)

## بۆچی پێویستە شوێنی سەلەف بکەوین لە تێگەیشتنمان بۆ دین؟ : (٢)

**پێشتر باسمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ سەلەفی بە باشترین جیل داناوە، ئێستەش چەند فەرموودەیەکی تر دەهێنین:**

**-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕاشدینە ڕێنمونیکارەکانی دوای منەوە، وە قەپی پیا بکەن بە شەویلگەکانتان، وە ئاگاداری داهێنراوەکان بن، چونکە هەموو بیدعەیەک گومڕاییە)**

**بڕوانە سنن الترمذي : فەرموودەی ژمارە ٢٦٦ : الترمذي فەرموویەتی ئەمە فەرموودەیەکی حسن و صحيحە .**

**بڕوانن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمان بە چی دەکات؟ فەرمانی کردووە دەست بگرین بە سوننەتی خۆی و جێنشینەکانی دوای خۆی کە مەبەست پێی ابو بکر و عمر و عثمان و علي ـە، الله عز وجل لە هەموویان ڕازی بێت، وە مەبەست لەوەی کە دەفەرمووێت قەپی پێدا بکەن واتە توند دەستی پێوە بگرن و بەری مەدەن، هەڵبەتە وشەی سوننەت تەنها ئەو کردارانە ناگرێتەوە کە کردنیان خێرە و نەکردنیان هیچ تاوانت لەسەر نیە، بۆ نمونە شەونوێژ و سیواک کردن و کارەکانی تر، بەڵکو سوننەت بە واتای ڕێباز و ڕێچکە و ڕێگا دێت، واتە لە پاڵ ڕێبازی خۆیدا باسی ڕێبازی هاوەڵانیشی کردووە.**

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئەستێرەکان پارێزراوی و ئاسایشن بۆ ئاسمان، هەر کات ئەستێرەکان نەمان ئاسمان ئەو بەڵێنەی پێی دراوە دێتە جێ، وە من پارێزراوی و ئاسایشم بۆ هاوەڵەکانم، هەر کات من ڕۆشتم ئەو هەڕەشەیەی لێیان کراوە دێتە جێ وە هاوەڵانم پارێزراوی و ئاسایشن بۆ ئوممەتەکەم هەر کات هاوەڵانم ڕۆشتن ئەو بەڵێنەی لەسەر ئوممەتەکەمە دێتە جێ. )**

**بڕوانە صحيح مسلم : فەرموودەی ژمارە : ٢٥٣١**

**والله اعلم، ئەو بەڵێنەش مەبەست پێی تەفرەقە و جیا جیا بوونی ئەم ئوممەتەیە هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (جولەکەکان دابەش بوون بۆ حەفتا و یەک یان حەفتا و دوو تاقم، گاورەکانیش بە هەمان شێوەی ئەوان، وە ئەم ئوممەتەی منیش دابەش دەبێت بۆ حەفتا و سێ تاقم. )**

**بڕوانە سنن الترمذي : فەرموودەی ژمارە ٢٦٤٠ : الترمذي فەرموویەتی ئەمە فەرموودەیەکی حسن و صحيحە.**

#پۆستی : (٦١)

## بۆچی پێویستە شوێنی سەلەف بکەوین لە تێگەیشتنمان بۆ دین؟ : (٣)

**لەو دوو پۆستەی پێشوو هێندەی پێویست بێت بەڵگەمان هێنایەوە لەسەر پێویست بوونی شوێنکەوتنی سەلەف، بەڵام بۆ ئەوانەی کە هێشتا قەناعەت ناکەن و دان بە مەنهەجی سەلەفدا نانێن و شوێنی ناکەون.**

**دەپرسم ئایا لە دوای پێغەمبەر ﷺ الله عز وجل بە هۆی کێوە دینەکەی پاراست؟ چۆن دینەکە گەیشتە کەسانی دوای پێغەمبەر ﷺ؟ چۆن گەیشتە ئێمە؟ بێگومان بە هۆی هاوەڵانەوە بوو، هاوەڵان لەو کاتەدا کە ئایەتێک دادەبەزی لەوێ ئامادە بوون وە کە پێغەمبەر ﷺ شتێکی دەفەرموو ئەوان ڕاستەوخۆ لەویان دەبیست، لەو مەوقیفەی کە ئایەت و فەرموودەکەی لێ دەهات لەوێ بوون، واتە دەیانزانی بۆچی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی وا دەفەرموون.**

**دەی کەواتە کە ئەوان ئایەتێک یان فەرموودەیەک تەفسیر بکەن یان کەسێک تەفسیری بکا کە دوای چەندەها سەدە لە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لە دایک بووە، ئایا تەفسیری کامیان ڕاستترە، کەسێک کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ فەرموودەکە بووە یان کەسێک کە لەوێ نەبووە؟ بێگومان ئەوەی عاقڵ بێ لە وەڵامدا دەڵێ ئەوەی لەوێ بووە باشتر تێگەیشتووە.**

**خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵان نەیپێکابێت لە مەسەلەیەکدا ئەوا کەسانێکی تر لە هاوەڵان بە تەئکید بۆیان ڕاست کردووەتەوە و نەیانهێشتووە شتێکی هەڵە بەوانەی دوای خۆیان بگات، لەم بارەشەوە چەند نموونەیەک هاتووە کاتێک هاوەڵێک لە فتوایەکدا نەیپێکابێت ئەوە هاوەڵانی تر رضي الله عنهم جميعا بۆیان ڕاستکردووەتەوە.**

**جا تابعینیش لای هاوەڵان فێری دین بوونە و لەوانیان وەرگرتووە، وە ئەتباعی تابعینیش لە تابعین دینیان وەرگرتووە.**

**هەروەکو وتیشمان هەر کەسێک بیدعەی ئەنجامدابێت و لە سوننەت لایدابێت بە توندترین شێوە ڕووبەڕووی بوونەتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە هیچکام لە هاوەڵان بیدعەیان نەکردووە، بەڵام مەبەستم کەسانی دوای خۆیانە**

**جا بۆیە ڕەحمەتتان لێبێت دینتان بە تێگەیشتنی کەسانێکی شارەزا وەرگرن کە ئەو کەسانە سەلەفن، لەم قسانە مەبەستم ئەوە نیە بۆ قورئان و فەرموودە بەدیل بدۆزنەوە بەڵکو دەڵێین قورئان و فەرموودە بە تێگەیشتنی کەسانێکی باشتر وەربگرن.**

**لە وتەی ئەم تابیعیە بەڕێزە ڕابمێنە.**

**●أيوب - السختياني رحمه الله - وتی : پیاوێک بە مطرف ی وت : ئێوە شتێکی باشترتان ئەوێت لە قورئان؟**

**وتی : نەخێر، بەڵکو کەسێکمان ئەوێت شارەزاتر بێت لە ئێمە بە قورئان.**

**كتاب العلم لـ أبي خيثمة : ٩٧**

**:مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ تێگەیشتنی هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون هەتا بە شێوەیەکی ڕاست لە قورئان و فەرموودە تێبگەن. چونکە باشترین تێگەیشتن بۆ ئیسلام بریتیە لە تێگەیشتنی سەلەف رحمهم الله تعالى.**

**جا إن شاء الله تعالى هەوڵ ئەدەین وردە وردە بچینە ناو باسکردنی عەقیدەی سەلەفەوە، وبالله التوفيق.**

## سوننەت چییە؟

سوننەت وشەیەکی عەرەبی یە (السُّنّة) لە ڕووی زمانەوانییەوە بە واتای ڕێباز یان مەنهەج دێت، جا لە شەرعدا سوننەت لە چەند حاڵەتێک یان چەند ڕوویەک خۆی دەبینێتەوە.

-محمد ی کوڕی نەصرِ ی المروزي (٢٩٤ ھ) لە [کتاب السنة : لاپەڕە ١١٥] دەڵێت : (سوننەت لەسەر چەند ڕوویەک خۆی دەنوێنێت : سوننەتێک زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە واجبە، وە سوننەتێکیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی نافیلەیە، وە سوننەتێک جیاوازیان تێیدا هەیە ئاخۆ واجبە یان نافیلە؟)

واتە سوننەت تەنها ئەوە نیە کە خەڵکی لێی تێگەشتووە، بەڵکو هەندێکی واجبە و هەندێکی نافیلەیە، سوننەتە نافیلەکانیش ئەوانەن کە بە کردنیان خێرت بۆ دەنوسرێت و بە نەکردنیشیان هیچت لەسەر نییە، بۆ نمونە سیواک کردن یان شەونوێژ، ئێمە لێرەدا زیاتر ئەو بەشەی سوننەتمان مەبەستە کە واجبە.

-محمدی کوڕی نەصرِ المروزي دەڵێت : (ئەو سوننەتەی کە کۆدەنگن لەسەر واجب بوونی ئەوا بە دوو شێواز خۆی دەنوێنێت : یەکەمیان کردەوەیە، ئەوەی تریشیان ئیمانە . ئەوەی کە کردەوەیە بە چەند شێوازێک خۆی دەنوێنێت :

سوننەتێکیان زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی تەفسیری ئەو شتانەیە کە الله لە قورئاندا بە گشتی فەرزی کردووە، وە تەفسیرەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ داناوە، هەروەکو فەرموویەتی : ( وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ) (النحل : ٤٤)

واتە : ئەم قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاندووە ئەی پێغەمبەر تاکو ئەوە ڕوون بکەیتەوە بۆ خەڵکی کە بۆیان دابەزیوە.

:واتە الله تعالی چەند حوکمێکی داوە لە کتێبەکەی خۆیدا، بۆ نمونە نوێژی فەرز کردووە بەڵام نەیفەرمووە نوێژەکان چەند ڕکعەتن، چی بخوێنن تێیدا، یاخود نوێژ بە چی بەتاڵ دەبێتەوە؛ بەڵکو ڕوون کردنەوەی ئەم شتانەی داناوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا سوننەت لەسەر ئەم ڕووە واجبە.

جا هەروەکو محمدی کوڕی نەصرِ المروزي وتویەتی، ئەو سوننەتەی کە باس لە ئیمان و بیروباوەڕ دەکات واجبە لەسەر موسڵمان، چونکە موسڵمان دەبێت هەمان ئەو بیروباوەڕەی هەبێت کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی هەیان بووە.

وە زۆربەی زانایانی سەلەف کتێبەکانیان ناو ناوە سوننەت (السنة ) و لە کتێبەکانیشیاندا تەنها باسی بیروباوەڕ کراوە و باسی هیچ کام لەو شتانە نەکراوە کە بە کردنیان خێرت بۆ دەنوسرێت و نەکردنیشیان هیچ گوناهت بۆ نانوسرێت.

بۆیە ئەو سوننەتەی باس لە بیروباوەڕ دەکا مەنهەجێکە نابێت موسڵمان دەستی لێ بەربدات، ئەگەر لەسەر ئەو مەنهەجە لاچوو ئەوا بە کەسی سوننی حساب ناکرێت، وە شەرت نییە هەر کەس شیعە نەبوو سوننی بێت،

بەڵكو سوننی ئەو كەسەیە كە لەسەر ئەو بنچینانە دەڕوا كە زانایانی سەلەف لە هاوەڵان و تابعین كۆدەنگیان لەسەری هەبووە، هەروەها خۆشی لە ئەنجامدانی بیدعە پاراستووە.

إن شاء الله تعالى لە پۆستەكانی داهاتوودا زیاتر دەچینە ناو بابەتەكانەوە.

#پۆستی : (٦٣)

## ئیمان چییە؟

یەكەم شت كە سەلەف دەستیان بە باسكردنی كردووە لە زۆربەی نووسراوەكانیاندا بریتییە لە ئیمان، ئێمە پێشتر باسی پایەكانی ئیمانمان كرد، بەڵام ئیمان خۆی چییە؟

جەریری كوڕی عبدالحمید (١٨٨ هـ) دەڵێ : ئیمان وتە و كردەوەیە، زیاد و كەم دەكات.

-الفضیلی كوڕی عیاض (١٨٧ هـ) دەڵێ : ئیمان لای ئێمە ناوەوە و دەرەوەی بریتییە لە : دانپێدانان بە زمان، وە قبوڵ كردن بە دڵ، وە كاركردن پێی - واتە كار كردن بە لاشە. -

السنة لعبدالله : ٦١٣

-حەربی كوڕی إسماعیل (٢٨٠ هـ) دەڵێ : ئیمان وتە و كردەوە و نیەت و دەست گرتنە بە سوننەتەوە.

هەروەها دەڵێ : ئیمان زیاد و كەم دەكات.

السنة لحرب الكرماني: ٢ و ٣

وتەی زۆر زانای دیكەی سەلەف هەیە دەربارەی ئەم بابەتە بەڵام لەبەر درێژنەبوونەوە نەمانهێنا، زۆربەی زانایان ئەوەیان وتووەتەوە سەبارەت بە ئیمان، هەندێك زانای سەلەف وتەكانیان بە شێوازێكی تر دەربڕیوە بەڵام ئەگەر لە وتەكە بكۆڵێتەوە هەمان مەبەستیان هەیە.

كاتێك كە زانایان دەڵێن وتە و كردەوەیە، واتە وتەی دڵ و وتەی زمان، لەگەڵ كردەوەی دڵ و كردەوەی زمان، كە هەمان شت دەكاتەوە لەگەڵ ئەوانەی كە دەڵێن ئیمان وتە و كردەوە و نیەتە، وە كردەوەش دەبێت لەگەڵ سوننەتدا ڕێك بكەوێت و سوننەت بپێكێت نەک بیدعەی تێدا بێت.

-هەروەها كەم و زیاد دەكات هەروەكو إبن بطة (٣٨٧ هـ) دەڵێ : زۆری كردەوە و وتەی چاك زیادی دەكات، وە سەرپێچی كردن كەمی دەكاتەوە.

وە ئیمان سەرەتایەكی هەیە، پاشان بەرزبوونەوە و زیاد بوونێك بە بێ كۆتایی.

هەروەكو الله فەرموویەتی : (وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا )(المدثر : ٣١)

واتە : وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ئیمانیان زیاد بكات.

وە موعاذی كوڕی جەبەل رضي الله عنه بە پیاوێكی وت : دامان نیشێنە با سەعاتێک ئیمان بهێنین.

**إبن بطة وتى : مەبەستى ئەوەیە یادى الله دەكەین، بەوەش ئیمانمان زیاد دەكات، وە هەر شتێك زیاد بكات كەمیش دەكات.**

**الإبانة الصغرى : ٢٤٢ و ٢٤٣**

**جا بزانە هەموو زانایانى سەلەف لە ئەهلى سوننە كردەوەیان لە ئیمان حساب كردووە، واتە بە بێ كردەوە ئیمان دانامەزرێت، هەروەها ئیمان كەم دەكات تا ئەو ئاستەى كە هیچى نەمێنێتەوە وە زیادیش دەكات و زیاد بوونەكەشى بە وتە و كردەوەى چاكەیە.**

**وە هەر كەس شتێكى جیاواز لەمە بڵێ ئەوا بە كۆدەنگى هەموو زانایان لە سوننەت لایداوە و گومڕابووە.**

**مورجیئەكان ئەڵێن ئیمان تەنها وتەیە، بەم قسەیە لە ئیسلام دەرناچن بەڵام لەلایەن سەلەفەوە بە بیدعەچى دانراون، وە جەهمیەكان (غولاتى مورجیئەكان) ئەڵێن ئیمام تەنها باوەڕى دڵە، بەم قسەیەیان لە ئیسلام دەرچوون و سەلەف تەكفیریان كردوون.**

**#پۆستى : (٦٤)**

## كۆمەڵێك هەڵە دەربارەى ئیمان

**چەند قسەیەك دەكرێت سەبارەت بە ئیمان كە لە سەردەمى سەلەف تەنها گومڕاكان كردوویانە، لەو قسە باوانە:**

**ئیمان تەنها لە دڵدایە، ئیمان تەنها وتەیە، یان ئیمان تەنها نیەت و وتەیە، یان ئیمان زیاد و كەم ناكات، كردەوە لە ئیمان نییە، كردەوە شەرتى كەماڵە.**

**ئەم وتانە هەمووى وتەى گروپە گومڕاكانن ئاگاداریان بن.**

**-حرب الكرماني (٢٨٠ هـ) دەڵێت : هەر كەس لافى ئەوەى لێدا كە ئیمان وتەیە بەبێ كردەوە؛ ئەوا مورجیئەیە.**

**وە هەر كەس لافى ئەوەى لێدا ئیمان وتەیە و كردەوەكانیش شرائعن - واتە شەرتى كەماڵن - ئەوا مورجیئەیە**

**وە هەر كەس لافى ئەوەى لێدا كە ئیمان زیاد و كەم ناكات؛ ئەوا مورجیئەیە.**

**وە ئەگەر وتى : ئیمان زیاد دەكا و كەم ناكات؛ ئەوا قسەى مورجیئەكانى كردووەتەوە.**

**وە هەر كەس لافى ئەوە لێبدا كە خەڵكى لەڕووى زیاد و كەمى ئیمانەوە جیاوازیان نییە ئەوا درۆى كردووە.**

**وە هەر كەس لافى ئەوە لێبدات كە ناسین بە دڵ سوود دەگەیەنێت، ئەگەر چى دەریشى نەبڕێت؛ ئەوا جەهمییە**

**بڕوانە كتێبى السنة لحرب الكرماني : ئەثەرى ٦ تا ١٣**

**مورجیئەكان كۆمەڵەیەكى گومڕا بوون، جەهمیەكان كۆمەڵەیەكى كافر بوون بوون، إن شاء الله لە داهاتوودا باسیان لێوە دەكەین.**

هەروەها نابێت بوترێت : فلان کەس ئیمانی کامڵ بووە:

إسحاق الكوسج (٢٥١ هـ) وتی : بە إسحاقی کوڕی راهویەم (٢٣٨ هـ) وت : ئایا ئیمان کۆتایی هەیە تاکو بتوانین بڵێین : ئەو پیاوە ئیمانی کامڵە؟

وتی : نەخێر؛ چونکە هەموو گوێڕایەڵیەکان لە ئیمانن، بۆیە ناکرێت شاهێدی کامڵ بوونی ئیمان بۆ هیچ کەس بدەین جگە لە پێغەمبەران، یان ئەو کەسانەی پێغەمبەران شاهێدی بەهەشتیان بۆ داون، چونکە پێغەمبەران ئەگەر گوناهیشیان کردبێ ئەوا الله لێیان خۆش بووە پێش ئەوەی دروست بکرێن.

بڕوانە کتێبی السنة للخلال: ئەثەری ٩٥٧

کەس ئیمانی کامڵ نابێت، چونکە مرۆڤ بەردەوام هەڵە و تاوان دەکا، هەر کەسیش هەڵە و تاوان بکا ئیمانی کەم دەکات بە پێی هەڵە و تاوانەکەی، جا بۆیە بە کەس نابێت بوترێت ئیمانی کامڵە، چونکە ئیمان کۆتاییەکی نییە، وە هەموو گوێڕایەڵیەکان لە ئیمانن، جا ناتوانیت شایەتی بدەیت بۆ کەسێک بڵێیت هەموو گوێڕایەڵیەکان ئەنجام ئەدات، جگە لەوانەی لە ئەثەرەکەی سەرەوەدا باس کراوە.

هەروەها کۆمەڵێک وتیان کردەوە شەرتی کەماڵە لە ئیماندا، ئەم وتەیە بە مانای ئەوە دێت کە بڵێت : ئەگەر کردەوەش نەکات ئیمانی هەیە بەڵام ئەگەر کردەوە بکات ئەوا ئیمانی کامڵ دەبێت!!

ئەم وتانە و هاوشێوەکانیان هەمووی وتەی گرووپە گومڕاکانن، ئینسانی موسڵمان بۆ ئەوەی لە سوننەت لا نەدات دەبێت خۆی لەو وتانە و ئەهلەکەشی بە دوور بگرێت و بە گومڕایان بزانێت.

#پۆستی : (٦٥)

## ئایا ئیسلام و ئیمان هەمان شتن؟

ئایا ئیسلام و ئیمان هەمان شتن؟ زۆر کەس لەمەدا کەوتونەتە هەڵەوە، ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە ئیسلام و ئیمان دوو شتی جیاوازن.

-ابن بطة (٣٨٧ هـ) دەڵێت : پاشان لە دوای ئەمە بزانیت کە ئیسلام بە واتای ئیمان نایەت ؛

ئیسلام ناوێکە و واتاکەی بریتیە لە دین.

وە ئیمان ناوێکە و واتاکەی بریتیە لە بە ڕاست دانان.

هەروەکو الله عز وجل دەفەرموویێت : ( وَمَا أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا )(یوسف : ١٧) مەبەستی ئەوەیە : کە بە ڕاست دامان نانێیت.

وە ئایەت لە بارەی ڕاستی و دروستی ئەوەی کە وتمان زۆرە، هەروەکو : ( قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا ) (الحجرات : ١٤)

واتە : عەرەبە دەشتەکیەکان وتیان ئیمانمان هێناوە، ئەی محمد ﷺ بڵێ ئیمانتان نەهێناوە بەڵکو بڵێن موسوڵمان بووین.

بڕوانە الإبانة الصغرى : ئەڤەری ٢٤٩

ئایەتەی ١٧ لە سورەتی یوسف باس لەو کاتە دەکا کە براکانی پێغەمبەر یوسف علیهم السلام بە کراسە خوێناویەکەوە هاتن بۆ لای باوکیان و وتیان : یوسف گورگ خواردویەتی ئەگەر ئێمە ڕاستگۆش بین ئەوا تۆ بڕوامان پێ ناکەیت، واتە قسەکانمان بە ڕاست نازانیت.

جا مەبەستی ابن بطة ئەوە بوو کە بە بەڵگەی ئەو ئایەتە و چەند ئایەتێکی تر واتای ئیمان بریتیە لە : بە ڕاست دانان.

هەڵبەتە ئەم واتایە بۆ ئیمان تەنها لە ڕووی زمانەوانیەوەیە، ئەگەر نا لە ڕووی شەرعەوە سەلەف هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی ئیمان بریتیە لە نیەت و وتە و کردەوە لەگەڵ پێکانی سوننەت.

وە بۆ زیاتر ئاشنابوون بە جیاوازی نێوان ئیمان و ئیسلام ئەتوانن تەماشای ئەو فەرموودەیە بکەن کاتێک جبیرل علیه السلام دێت بۆلای رسول الله ﷺ و پرسیاری ئیسلام و ئیمان لە رسول الله ﷺ ئەکات.

چونکە هەر ابن بطة دەڵێت :

وە بەڕاست دانانی ئەمە بریتیە لە:

وتە بە زمان، وە بەڕاست دانانە لە ناخەوە، وە کردەوەیە بە ئەندامەکان.

بڕوانە الإبانة الصغرى : ئەڤەری ٢٤١

جا واتای ئیمان بزانە کە بە واتای ئیسلام نایەت، وە ان شاء الله تعالى لە پۆستی داهاتوو زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

*#پۆستی : (٦٦)*

## جیاکاریکردن لە ئیماندا چییە؟

جیاکاریکردن کە پێشی دەوترێت (الإستثناء) لە ئیماندا ئەوەیە بڵێیت : من ئیماندارم إن شاء الله.

واتە نابێت بەبێ وتنی (إن شاء الله) بەڕەهایی بڵێیت من ئیماندارم.

ابن بطة (٣٨٧ هـ) دەڵێ : پاشان جیاکاری کردن لە ئیماندا؛ ئەویش بەوە دەبێ کە پیاو بڵێت : إن شاء الله

عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه هەر ئەمەی دەوت.

وە زانایانی دوای خۆی ئاوها وەریانگرتووە، وەکو : علقمة، و الأسود، و ابي وائل، و مسروق، و منصور، و مغیرة، و ابراهیم النخعي، و الاعمش، و حماد بن زید، و یزید بن زریع، بشر بن المفضل، و معاذ بن معاذ، و سفیان بن حبیب، و سفیان الثوري، و ابن المبارك، و الفضیل بن العیاض وە کۆمەڵێکی تر لە غەیری ئەمان کە بە باس کردنیان کتێبەکە درێژ دەبێتەوە.

بڕوانە کتێبی الإبانة الصغرى : ئەڤەری ٢٤٤ و ٢٤٥

ئەم کەسانەی کە ابن بطة ناوی هێنان هەموویان تابعی یان تابعی تابعی بوون جگە لە عبدالله ی کوڕی مەسعود کە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ، جا لێرەوە دەردەکەوێت کە زانایانی سەلەف بە بێ إن شاء الله واتە بە بێ جیاکاری نەیانوتووە ئیمانداربن.

بۆچی؟ ئایا هۆکارەکەی ئەوەیە کە گومانیان لە ئیمانی خۆیان هەبووە؟

## مەگەر هەبوونی گومان لە ئیماندا کوفر نییە؟

بەڵێ هەبوونی گومان لە ئیماندا کوفرە، بەڵام ئەم جیاکاریە لەبەر گومان نییە، بەڵکو هۆکار ئەوەیە کە الله تعالى بەڕەهایی باسی کردووە کە ئیمانداران دەچنە بەهەشتەوە هەروەها کەسیش نازانێت ئاخۆ الله عز وجل ئیمانەکەی لێ قبوڵ دەکات یاخود نا؟ جا بۆیە کە تۆ بە بێ جیاکاری دەڵێیت ئیماندارم ئەوا وەکو جورئەتێک و چاوقایمیەک وایە بەرامبەر بە الله، ئەگەر بەڕەهایی بڵێیت ئیماندارم واتە ئەهلی بەهەشتم و ئیمانەکەم لێ قبووڵ کراوە.

ئاخر تۆ چۆن دەزانی الله ئیمانەکەت لێ قبوڵ دەکات تاکو بەوپەڕی جورئەتەوە بڵێی ئیماندارم؟! جا بۆیە دروست نیە و بیدعەیە کە بەبێ جیاکاری بڵێیت ئیماندارم، وە ناشبێت گومانت لە ئیمانی خۆت هەبێت.

هەروەکو ابن بطة دەڵێ : وە ئەم جیاکاریە لەسەر یەقین و دڵنیایی دەکرێت، هەروەکو الله عز وجل فەرموویەتی : ( لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ)(الفتح : ٢٧)

واتە : إن شاء الله بە سەلامەتی دەچنە مزگەوتی حەڕامەوە واتە کەعبە.

بڕوانە الابانة الصغرى : ٢٤٥

ئەم ئایەتەی سەرەوە کاتێک دابەزی کە الله عز وجل مژدەی فەتحی مەککەی دا بە ئیمانداران، جا لێرەدا ببینە کە الله تعالى دەشزانێت ئیمانداران دەچنە کەعبەوە بەڵام جیاکاری دەکات، کەواتە دەردەکەوێ کە ئەم جیاکاریە و وتنی (إن شاء الله) لەبەر هەبوونی گومان نیە .

بڕوانە ئەم فەرموودانە تاکو بابەتەکە ڕوونتر ببێتەوە لە لات:

-پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (سوێند بە الله من تکام وایە کە لە هەمووتان زیاتر لە الله بترسم و زاناترینیشتان بم بەوەی کە لێی دەترسم . )

رواه مسلم (٢٥٦٢. )

-هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە بە لای گۆڕستانی بەقیعدا تێپەڕیوە فەرموویەتی : (ئێمەش إن شاء الله بە ئێوە دەگەینەوە)

رواه مسلم (٢٢١٥. )

**بروانە پێغەمبەر ﷺ چۆن دڵنیاش بووە و جیاکاریشی کردووە، ئاخۆ کەس هەیە لە خۆی تەقوادارتر بێت؟ بێگومان نەخێر بەڵام جیاکاریشی کردووە، هەروەها کەس هەیە نەزانێت کە وەفات دەکات؟ بێگومان هەموو کەس دەزانێت بەڵام جیاکاریشی کردووە.**

**جا ئەم جیاکاری کردنە لە ئیماندا واجبە، وە پرسیار کردن دەربارەی ئیمانی یەکتر بیدعەیە، هەرکات پرسیارت لێکرا سەبارەت بەوەی کە (ئایا ئیمانداریت؟) دەتوانیت وەڵام نەدەیتەوە، ئەگەر وەڵامیشت دایەوە بڵێ : ئیماندارم إن شاء الله.**

**یان باوەڕم بە الله عز وجل و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و قەزا و قەدەر و ڕۆژی دوایی هەیە**

**بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی لەم بابەتەدا بڕۆنە ناو ئەم کەناڵەوە و عەقیدەی پێشەوا الأوزاعي (١٥٧ هـ) بخوێننەوە بە کوردی** https://t.me/mejd_henbeli

**#پۆستی : (٦٧)**

## قەزا و قەدەر : (١)

**خەڵکی هەر لە سەردەمی سەلەفەوە تاکو ئەمڕۆ لە بابەتی قەزا و قەدەردا کەوتونەتە هەڵەی زۆر گەورەوە، وە لەم بابەتەدا زۆر گرووپی گومڕا دروست بوونە، وە ناشتوانین پشت گوێی بخەین و لێی تێ نەگەین چونکە یەکێکە لە شەش پایەکەی ئیمان هەروەکو پێشتر باسمان کرد دەبێت بڕوامان بە قەزا و قەدەر هەبێت بە خێر و بە شەڕیەوە.**

**جا بۆ یەکلابوونەوە لەم بابەتەدا و هەر بابەتێکی تر کە لە لایەن خەڵکیەوە ناکۆکی لەسەرە و هەر کەسەو بە جۆرێک باسی دەکات، ئەوا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ مەنهەج و بیروباوەڕی زانایانی سەلەف و بزانین ئەوان چۆن لە بابەتەکەیان ڕوانیوە.**

**یەکێک لەو زانایانەی کە لە کتێبەکەیدا کۆدەنگی سەلەفی نەقڵ کردووە و کتێبەکەی بە سەرچاوەیەکی زۆر گرنگ دادەنرێت بۆ زانینی بیروباوەڕی سەلەف، بریتیە لە حەربی کوڕی اسماعیل کە ناسراوە بە حەربی کرمانی (٢٨٠ هـ)، ئەم ئیمامە بەڕێزە قوتابی ئیمام أحمدی کوڕی حەنبەل و إسحاقی کوڕی ڕاهویە بووە کە دوو پێشەوای گەورەی سەلەفن، وە لەوانەوە بیروباوەڕ و کۆدەنگی سەلەفی نەقڵ کردووە.**

**لە بابەتی قەدەردا حەرب (٢٨٠ هـ) دەڵێ:**

**قەدەر**

**خێر و شەڕی**

**کەم و زۆری**

**رووکەش و پەنهانی**

**خۆش و ناخۆشی**

**ئەوەی خۆشەویستە و ئەوەی پێت ناخۆشە**

**باش و خراپی**

**سەرەتا و کۆتایی**

**هەمووی لەلایەن الله تبارک وتعالى ـوەیە**

**بڕیارێکە داویەتی بەسەر بەندەکانی**

**وە قەدەرێکە بۆی داناون**

**هیچ یەکێک لە بەندەکان دەرناچن لە ویستی الله عز وجل و بڕیارەکانی**

**بەڵکو هەموو بەندەکان بەرەو ئەوە دەچن کە الله دروستی کردوون بۆی، وە توشی ئەو قەدەرە دەبن کە الله بۆی داناون هیچ چاریان نیە، ئەمەش دادپەروەرییە لەلایەن الله، عز ربنا وجل.**

**بڕوانە كتاب السنة لحرب الكرماني : ئەثەری ژمارە ١٥**

**واتە هەرچی شتێک ڕوودەدات بە چاک و خراپەوە ویستی الله تعالى ـی لەسەر بووە، جا لێرەدا دەبێت بزانین کە ویست چییە؟ (ویست) واتە ئیرادە و جیاوازە لە (ڕەزامەندی)، جا کە حەرب دەڵێت باش و خراپی لە لایەن الله تعالى ـوەیە، تۆ وا تێمەگە کە مەبەستی ئەوە بێت کە الله تعالى بە خراپە ڕازیە و ڕەزامەندی لەسەرە! نا بەڵکو تەنها ئیرادەی الله تعالى ـی لەسەرە، بۆ نمونە کەسێک نوێژ دەکات ئەمە هەم ویستی الله تعالى ـی لەسەرە هەم ڕەزامەندیەکەی، بەڵام کەسێک کارێکی خراپ دەکات ڕەزامەندی الله تعالى ـی لەسەر نیە و الله تعالى ڕازی نیە بە کاری خراپە تەنها ویستی لێبووە کە ڕوویدا، واتە ئەگەر الله تعالى مۆڵەت نەدات بەوەی کارێکی خراپ ڕوویدات ئەوە هەرگیز ڕوونادات، وە لە هەمان کاتیشدا ڕەزامەندی لەسەر کارەکە نییە، بەڵکو بۆ حیکمەتێک ڕێگە ئەدات ڕوویدات، جا بزانە کە ویست و ڕەزامەندی دوو شتی جیاوازن و تێکەڵیان مەکە**

**هەڵبەتە ئەم قسانەی حەرب شتێکی لەو جۆرە نین کە تۆ بتوانیت بڵێیت: (ڕای خۆی بووە و نەیپێکاوە)، ئەم قسانە چەندین بەڵگەی لە قورئان و سوننەت لەسەرە، هەروەها کۆدەنگی هاوەڵان و هەموو زانایانی سەلەفیشی لەسەرە و هیچ زانایەکی ئەهلی سوننە نادۆزیتەوە لە بابەتی قەدەر شتێکی دژی ئەمەی وتبێت.**

**وە نەهیمان لێکراوە ئەوەی لەناو بابەتی قەدەردا ڕۆبچین و بڵێین فڵانە شت بۆ وایە و ئەگەر وابوایە باشتر ئەبوو یان شتی تر، هەر وەک چۆن ئیمامی البربهاري لە کتێبی شرح السنة قەدەر ناو ئەبات بە (نهێنی الله تعالى)، لەبەر ئەوە تەسلیمی ئەبین و بە مێشکە پوچەکەی خۆمان قسەی تێدا ناکەین و دژی ناوەستینەوە.**

**جا ئەگەر تۆ ئەم قسانە ڕەت بکەیتەوە ئەوا دژی چەندین ئایەت و فەرموودە وەستاویت و دژی هەموو زانایانی سەلەف وەستاوی، وە دڵنیاشبە هیدایەت لە شتێکدا نییە کە دژی قسەی سەلەف بووبێت، بۆیە ئەگەر هیدایەتت دەوێ تەسلیمی وتەکانیان بە.**

**إن شاء الله لە چەند پۆستێکی تردا ڕوونکردنەوەی زیاتر ئەدەین.**

#پۆستی : (٦٨)

## قەزا و قەدەر : (٢)

**ویستی الله عز وجل لە پێش ویستی بەندەکانیەوەیەتی، واتە بەندەکانی الله تعالی ویستیان هەیە بەڵام ویستی الله تعالی لە پێش و لە سەروو ویستی ئەوانەوەیە.**

**بڕوانە الله تعالی لە سورەتی التكوير دا دەفەرمووێت :** (إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ (٢٧) لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ (٢٨) وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) **(٢٩)**

**واتە: ئەم قورئانە یادخەرەوەیەکە بۆ جیهانیان، بۆ هەرکەسێکتان کە بیەوێت بێتە سەر ڕێگا ڕاستەکە، بەڵام ئێوە هیچ ویستێکتان نییە ئیلا دەبێت الله ی پەروەردگاری جیهانیان ویستی لێی هەبێت.**

**بڕوانە و تێبگە ڕەحمەتت لێبێ الله عز وجل لەم ئایەتەدا چی دەفەرمووێت، دەفەرمووێت کە ئێمە ویستمان هەیە بەڵام هەتا خۆی ویستی لە شتێک نەبێت ئێمە ناتوانین ویستمان لێی هەبێت، و لله المثل الأعلى، ئەگەر بە نمونەیەک ڕوونی بکەینەوە وەکو کەسێکە کە لە ژێر سەقفێکدایە دێت و دەچێ بەڵام هەرچی بکات ناتوانێت لە ژێر ئەو سەقفە لابچێت، واتە ئێمە هەر کارێک دەکەین ئەوا پێشتر الله تعالی زانیویەتی دەیکەین ویستی لێبووە بیکەین وە نوسیویەتی لەسەرمان و بڕیاری داوە لەسەرمان هەر ئەوەش دەکەین بێ ئەوەی دوا بکەوێت یان پێش بکەوێت.**

**سەبارەت بە هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتانەی سەرەوە محمدی کوڕی جریری الطبري** (٣١٠ هـ) **لە تەفسیرەکەیدا ئەم ڕیوایەتەی هێناوە : لە سلیمانی کوڕی موساوە وتی : کاتێک ئایەتی** (لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ) **دابەزی ئەبو جەهل وتی : کارەکە لە دەستی خۆمانە، ئەگەر ویستمان دێینە سەر ڕێگا ڕاستەکە، وە ئەگەر نەمان ویست نایەینە سەر ڕێگا ڕاستەکە.**

**بۆیە الله تعالی ئایەتی :** (وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) **(٢٩)ـی دابەزاند م**

**بڕوانە تەفسیری الطبري**

**واتە کاتێک الله تعالی فەرمووی : ئەمە بۆ هەر کەسێکە بیەوێت بێتە سەر ڕێگا ڕاستەکە، لەو کاتەدا ئەبو جەهل وتی کەی ویستمان دێینە سەر ڕێگاکە و کەی نەمان ویست نایەین، واتە وتی کە شتەکە لە دەستی خۆمانە، بۆیە الله ڕەتی دایەوە و فەرمووی : ئێوە هیچ ویستێکتان نییە مەگەر ئەوە نەبێ کە الله تعالی ویستی لێیە، واتە هەتاکو ئەو ویستی لەوە نەبێت تۆی بەندە شتێک ئەنجام بدەیت ئەوا بە هیچ شێوەیەک ناتوانین ویستت لە ئەنجامدانی هەبێت و بیکەیت.**

**ڕوونکردنەوەی زیاتر بۆ پۆستی داهاتوو دا ئەنبێین ان شاء الله تعالی.**

#پۆستی : (٦٩)

## قەزا و قەدەر : (٣)

حەرب (٢٨٠ ھ) دەڵێ :

عیلمی الله لە مەخلوقاتەکانی دیتە دی بە ویستی خۆی.

الله زانیویەتی ئیبلیس و غەیری ئەو کە سەرپێچیان کردووە لەو ڕۆژەوەی کە سەرپێچی الله کراوە هەتاکو بەرپابوونی قیامەت، وە بۆ ئەوەش دروستی کردوون.

وە زانیویەتی ئەهلی گوێڕایەڵی گوێڕایەڵی الله ئەکەن، وە بۆ گوێڕایەڵی کردن دروستی کردوون.

هەموو کەسێک کار بۆ ئەوە دەکات کە بۆی دروست کراوە، وە بەرەو ئەوە دەڕوات کە بڕیاری لەسەر دراوە و لێی زانراوە، هیچ یەکێکیان دەرناچێت لە قەدەر و ویستی الله، الله هەرچی بیەوێت ئەیکات.

بڕوانە کتاب السنة : ژمارە ١٦

مەبەست لە (عیلمی الله لە مەخلوقاتەکانی دیتە دی بە ویستی خۆی)

واتا الله لە ئەزەلەوە زانیویەتی مەخلوقاتەکانی چۆن دەبن و چ کردەوەیەک ئەنجام دەدەن، جا عیلمی الله لە ئەزەلەوە چۆن بووە بەم شێوەیە دیتە دی لە مەخلوقاتەکانیدا بە ویستی الله.

الله پێش ئەوەی مەخلوقات دروست بکات زانیویەتی هەر کامێکیان چۆن دەبن، ئەهلی خێرن یان ئەهلی شەڕ، جا ئەوەی ئەهلی خێر بووبێت لە عیلمی الله دا ئەوا بۆ خێر دروستی کردووە، ئەوەی ئەهلی شەڕیش بێت لە عیلمی الله دا ئەوا بۆ شەڕ دروستی کردووە.

الله بۆ چ شتێک دروستی کردبن بەرەو ئەوە دەڕۆن، زانیویەتی ئیبلیس چۆن دەردەچێت لە قەدەری ئیبلیس نوسیویەتی چۆن دەبێت و چی دەکات، جا ئیبلیس هەر ئەوە دەکات کە بۆی نوسراوە، باقی سەرپێچیکارانیش بەهەمان شێوە، وە ئەهلی چاکە و گوێڕایەڵیش الله پێش دروست کردنی زانیویەتی چۆن دەرئەچن، جا بۆ چاکە کردن و گوێڕایەڵی دروستی کردوون.

هەر یەکێکیش لەم دوو کۆمەڵەیە بەرەو ئەو قەدەرە ئەڕوات کە بۆی دروستکراوە و بڕیاری لەسەر دراوە، کەسیان ناتوانێت لێی لابدات.

جا لەم وتەیەی حەربەوە بۆمان دەردەکەوێ کە قەدەر دەکرێ بە چوار بەشەوە :

عیلمی الله بە ڕووداوەکە، ویستی الله بە ڕووداوەکە، نوسینەوەی ڕووداوەکە، پاشان ڕوودانی ڕووداوەکە بە بێ ئەوەی پێش یان دوابکەوێت.

ڕوونکردنەوەی زیاتر لە پۆستی داهاتوو ئەبێ إن شاء الله

#پۆستی : (٧٠)

ئەوانەی کێشەیان لە قەدەردا هەیە لە بارەی چاکەکردن یان هیدایەتدانەوە نیە، بەڵکو کێشەکەیان لە بارەی تاوان کردن و گومڕا کردنەوەیە.

دەڵێن ئێمە الله لەسەری نوسیبووین چاکە بکەین یان دەڵێن الله هیدایەتی داوین، بەڵام کە گومڕا دەبین یان تاوان دەکەین بە دەستی خۆمانە و الله ویستی لێ نەبووە!!!

هەڵبەت وتمان الله هەرگیز بە تاوان و گومڕایی ڕازی نیە و پێی خۆش نیە، بەڵام وتیشمان ویست جیایە لە ڕەزامەندی و پێ خۆش بوون.

-لە وەڵامی ئەم کەسانەدا حەرب (٢٨٠ هـ) دەڵێ :

هەر کەسێک پێی وابێت الله تبارک و تعالی خێر و گوێڕایەڵی ویستووە بۆ ئەو بەندانەی کە سەرپێچیان کردووە، وە بەندەکان خراپە و سەرپێچیان ویستووە بۆ خۆیان و بەپێی ویستی خۆیان کاریان کردووە، ئەوا ئەم کەسە پێی وایە ویستی بەندەکان زاڵترە لە ویستی الله!!

جا چ بوختانێک بە الله لەمە زیاترە؟!

بڕوانە کتاب السنة : ژمارە ١٧

هەر چەندە ڕوونکردنەوەشی ناوێت، بەڵام مەبەستی ئەوەیە ناکرێت الله ویستی لە شتێک بێت و تۆ پێچەوانەی ئەوە بکەیت، چونکە ئەو کات دەبێ بڵێیت کە ویستی بەندەکان زاڵە بەسەر ویستی الله عز وجل!

واتە ناکرێت بڵێی الله هیدایەتی بۆ فلانە کەس ویست بەڵام ئەو خۆی گومڕا بوو، ئاخر شتی وا چۆن دەبێت؟!

فلانە کەس بەندەی الله یە چۆن دەتوانێت بەسەر ویستی خالقەکەی خۆیدا سەرکەوێت؟!

جا زۆرینەی خەڵکی لە بابەتی قەدەرە خراپەکاندا بەرەو عەقیدەی قەدەری بوون ئەڕۆن کە گروپێکی گومڕا و کافر بوون لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا پەیدا بوون و قەدەریان بە درۆ دەخستەوە، خەڵکی ئێستاش تەنها هیدایەت ئەدەنە پاڵ الله، گومڕا کردن نادەنە پاڵی، ئەڵێن کەسێک الله هیدایەتی نەدات بە کەس هیدایەت نادرێت، بەڵام لە باسی گومڕا بووندا دەڵێن: الله کەس گومڕا ناکات کەسەکە لە دەست خۆیەتی!!

ئەمەش بیروباوەڕی قەدەریەکانە.

بۆیە بڕواننە ئەم دوو ئایەتە وەڵامە بۆیان:

(وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّۗ) (الزمر : ٣٧)

واتە: هەر کەس الله هیدایەتی بدا ئەوا کەس نیە گومڕای بکات.

(وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ) (الرعد : ٣٣)

واتە : هەر کەس الله گومڕای بکات ئەوا کەس نیە هیدایەتی بدات.

جا لەوانەیە وا تێبگەیت کە من دەڵێم الله خەڵکی ناچار کردووە تاوان بکەن، ئا بەو شێوەیە نیە پەلە مەکە لە پۆستەکانی داهاتوو ڕوونکردنەوە دەدەین إن شاء الله تعالی

#پۆستی : (٧١)

## قەزا و قەدەر : (٥)

زۆرێک لە خەڵکی دەڵێن: الله هیدایەتمان دەدا و بە ویستی ئەو چاکە دەکەین بەڵام ئێمە خۆمان گومڕا دەبین و تاوان دەکەین و ویستی الله ی لەسەر نیە!

ئەگەر لێیان بپرسیت بۆچی ویستی لەسەر تاوانکردنتان نیە؟ دەڵێن : ئاخر ئەگەر ویستی لەسەر بوایە ئەوا نەدەبوو سزامان بدات چونکە ئێمە هیچ تاوانمان نیە و ئەگەر سزامان بدات دەبێتە زوڵم! یاخود هەندێکیان دەڵێن ئەگەر خوایەک بیەوێت بەندەکەی تاوان بکات و دواتر سزاشی بدات ئەمە خوا نیە بەڵکو جەللادە. پەنا بە الله تعالی لەم بیروباوەڕە پیسە!!!

باشە ئەگەر زوڵم بێت سزات بدات ئەی بۆچی پاداشتیشت بداتەوە؟!

ڕوونتری کەمەوە؛ تۆ کە دەڵێیت الله تعالی هیدایەتی داوم چاکە بکەم و ویستی ئەوی لەسەر بووە، کەواتە تۆ هیچ دەورێکت نەبووە لەم چاکەکردنە کە هیچ دەوریشت نەبێت بۆچی پاداشتت بداتەوە!؟

خۆ لە پۆستەکانی پێشوو وتمان کە ابو جهل وتی بە دەستی خۆمانە هەر کات بمانەوێت هیدایەت وەردەگرین و هەر کاتیش نەمانەوێت وەری ناگرین، الله عز وجل لە ئایەتی دواتر ڕەددی دایەوە و فەرمووی ئێوە ناتوانن هیدایەت وەرگرن هەتا الله تعالی ویستی لێنەبێت هیدایەتتان بدا.

کە الله تعالی خۆی هیدایەتی داوی ئیمان بهێنی، نوێژ بکەی، ڕۆژوو بگری، حەج بکەی . . . هتد، بۆچی بۆ ئەمەشیان ناڵێی من شایەنی پاداشت نیم؟!

جا تێبگە ڕەحمەتت لێبێت ئەم پێوەرەت زۆر پووچە کە دەیهێنیتەوە و دەڵێی الله تعالی ویستی لەسەر نەبووە تاوان بکەین چونکە ئەو کات دەبێتە زوڵم ئەگەر سزامان بدات، ئاخر ئەگەر وابێت نابێت پاداشتی چاکەکانیشت بداتەوە چونکە هەر خۆی ویستی لێبووە چاکە بکەیت.

جا بۆیە ڕاست و دروست ئەوەیە تۆ وەکو کەسێک کە تەسلیمی فەرمانی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم بوویتە و دانت بە قەدەردا ناوە بە خێر و بە شەریەوە؛ بیروباوەڕت وابێت کە بڵێی هەموو شتێک بە ویستی الله عز وجل ڕوو دەدات بە چاک و بە خراپەوە، بە شیرین و تاڵەوە، الله عز وجل چاکەی پێخۆشە و پێی ڕازیە و خراپەی پێ ناخۆشە و پێی ڕازی نیە، وە ئەگەر الله تعالی ویستی لێ نەبێت ئەوە هیچ چاکە یان خراپەیەک لەسەر زەوی ڕوونادات، وە بۆ حیکمەتێک ڕێگەی داوە هەردووکیان ڕووبدەن.

الله تعالی کەسی ناچار نەکردووە تاوان بکات و خستویەتیە دڵیەوە کە ئەو کارەی دەیکات خراپە و پێی ناڕازییە، ڕاستە لە قەدەریدا نوسیویەتی کە دەیکا بەڵام هەر کەسەکە ئەنجامدەری تاوانەکەیە، وە الله تعالی لەبەر ئەوەی بە هەموو شتێک زانایە ئەزانێت کە تۆ چ ئەکەیت و چی ناکەیت، هەربۆیە پێش ئەوەی دروستت بکات نوسیوویەتی چی ئەکەیت و چی ناکەیت لە کاری چاکە یان خراپە، ئەمەش بۆ عەدل و حیکمەتی الله

تعالی دەگەڕێتەوە و نهێنی قەدەرە کە اللە تعالی لە بەندەکانی شاردویەتیەوە، کەسی موسڵمان تەسلیمی دەبێت بەڵام گومڕاکان یەکسەر لە دین هەڵدەگەڕێنەوە و دەڵێن مادام لەسەرمان نوسراوە ئەوا تەواو ئیسفادەی نیە تازە لەسەرمان نوسراوە کە کافر ببینەوە!!

ئەم قسەیە زۆر هەڵەیە چونکە کەس نازانێت چی بەسەر دێ و بۆ کوێ دەچێ، تەنها کار و کردەوەی خۆت بکە چونکە هەموو کەس ئەوەی بۆ ئاسان دەکرێت کە لەسەری نوسراوە.

هێشتا بابەتەکە ماویەتی. . .

#پۆستی : (٧٢)

## قەزا و قەدەر : (٦)

ئێستاش هەندێک لە وتەکانی حەربی کرمانی نەقڵ دەکەین کە ڕەددی ئەو کەسانە دەداتەوە کە پێیان وایە تاوانەکان لە قەدەرەوە نین.

حەرب (٢٨٠ هـ) دەڵێت:

هەر کەس پێی وابێت اللە تبارک و تعالی خێر و گوێڕایەڵی ویستووە بۆ ئەو بەندانەی کە سەرپێچیان کردووە، وە بەندەکان خراپە و سەرپێچیان ویستووە بۆ خۆیان و بەپێی ویستی خۆیان کاریان کردووە، ئەوا ئەم کەسە پێی وایە ویستی بەندەکان زاڵترە لە ویستی اللە تبارک و تعالی!

جا چ بوختانێک بە اللە لەمە زیاترە؟!

کتاب السنة : ژمارە ١٧

حەرب دەڵێت:

هەر کەس پێی وابێت کە یەکێک لە مەخلوقات بەرەو شتێکی تر ئەڕوات جگە لەوەی کە بۆی دروست کراوە، ئەوا نکۆڵی قودرەتی اللە ی کردووە لەسەر مەخلوقەکانی، ئەمەش بوختان کردنە بە اللە و درۆ کردنە بەناوی اللە.

کتاب السنة : ژمارە ١٨

حەرب دەڵێت:

هەر کەس پێی وابێت زینا بە قەدەری اللە ڕوو نادات، ئەوا پێی ئەووترێت:

ئەو ئافرەتەی کە سکپڕ بووە بە زینا و منداڵی بووە، ئایا اللە ویستی ئەم منداڵە دروست ببێت و لە عیلمی پێشینەی اللە دا هەبووە کە ئەمە ڕوو دەدات؟

ئەگەر وتی : نەخێر؛ ئەوا پێی وایە لەگەڵ اللە دا خالقێکی تر بوونی هەیە، ئەم ووتەیەش هاوشێوەی شیرکە، بەڵکو شیرکە.

:ئاشکرایە کە منداڵ یان بە هۆی جیماعی شەرعیەوە دروست دەبێ یاخود بە هۆی زیناوە، جا ئەگەر منداڵێک بە هۆی زیناوە دروست ببێت و کەسێک بڵێت الله ویستی لێ نەبووە ئەو زینایە ڕوو بدات، واتە ویستی لێ نەبووە هۆکارەکە ڕوویدا، ئەی کەواتە کێ ئەم منداڵەی خەلق کرد؟!! تۆ دەڵێی الله نەیویستووە ئەم کارە ڕوویدا ئەی کەواتە ئەم منداڵە چۆن دروست بوو؟! مەگەر پێت وایە خالقێکی تر بوونی هەیە جگە لە الله؟؟ پاک و بێگەردی بۆ الله لە قسەیەکی لەو جۆرە.

جا بۆیە ناتوانیت بڵێیت تاوانەکانمان لە قەدەرمان نەنوسراونەتەوە، هەڵبەت دووبارەشی دەکەمەوە ویستن جیاوازە لە ڕەزامەندی و پێ خۆش بوون، واتە الله ڕێگەی داوە زینا ڕوویدات بەڵام زینای خۆش ناوێت بەڵکو لەبەر حیکمەتێکی خۆی ڕێگەیداوە ڕوویدات.

-حەرب دەڵێت:

وە هەر کەس پێی وابێت دزی کردن و عەرەق خواردنەوە و خواردنی ماڵی حەرام بە قەزا و قەدەری الله نیە، ئەوا پێی وایە کە ئەم مرۆڤە تواناى هەیە ڕزقی کەسێکی تر بخوات، ئەم ووتەیەش هاوشێوەی ووتەی مەجوسی و نەصرانیەکانە.

بەڵکو ئەم کەسە ڕزقی خۆی خواردووە، وە الله بڕیاری داوە کە ڕزقەکەی بخوات بەو شێوەیەی کە خواردی.

کتاب السنة : ژمارە ٢٠

هەموو کەس ڕزقی دیاریکراوە جا ڕزقەکەی بە حەرام پەیدا بکات یان نا، کە تۆ دەڵێی دزی بە ویستی الله ڕوو نادا ئەوا ماناى وایە ئەم کەسە ڕزقی کەسێکی تری خواردووە!! نەخێر بەڵکو ڕزقی خۆی خواردووە بەڵام بە حەرامی، دواتر باسی مەجوسی و نەصرانیەکانیش دەکەین إن شاء الله.

حەرب دەڵێت:

وە هەر کەس پێی وابێت کوشتنی نەفس بە قەدەری الله عز وجل نیە، ئەوا پێی وایە کە کوژراوەکە مردووە بەبێ ئەو ئەجەلەی کە بۆی نوسراوە، جا چ کوفرێک بە الله ڕوونترە لەم کوفرە ؟!

بەڵکو هەموو ئەم تاوانانە بە قەزا و قەدەری الله یە، کە لە عیلمی پێشینەی الله ـدا هاتووە دەربارەیان، الله عەدل و حەقە، هەرچی بیەوێت دەیکات.

کتاب السنة : ژمارە ٢١

واتە ئەگەر الله تعالى نەیوستبێت ئەو کەسە بکوژرێت، ئەی کەواتە چۆن مرد؟ مەگەر تۆ ناڵێیت مردن نە پێش دەکەوێت و نە دوا دەکەوێت؟! ئێ باشە کێ ئەجەلی ئێمەی داناوە مەگەر هەر الله تعالى نیە؟ ئێ ئەگەر الله عز وجل نەیوستبێت قەتلەکە ڕوو بدا ئەی چۆن کوژراوەکە لە ئەجەلی خۆیدا مرد؟!

والله ئەم قسانەی حەرب ئاو دەکەن بە دڵدا، هەر کەس الله تعالى کوێری نەکردبێت لە ئاستی حەقدا زوو لە بابەتەکە تێ دەگات، بەڵام سوێند بە الله ئەگەر الله تعالى هیدایەتت نەدا ئەوا هەزار وتەی تری ئاوات بۆ بهێنم هێشتا دان بەوە نانێنیت کە تاوانەکانیش لە قەدەرەوەن.

#پۆستی : (٧٣)

## قەزا و قەدەر : (٧)

**ئێستا چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ نەقڵ دەکەین کە تەئکید لە قسەکانمان دەکاتەوە سەبارەت بە قەزا و قەدەر.**

**-پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :**

**(الله یەکەم شت قەڵەمی بە دەستی ڕاستیەوە گرت و، هەردوو دەستیشی ڕاستن، جا دونیای نووسیەوە بە هەموو ئەو کارانەشەوە کە تێیدا ڕوو دەدەن لە چاک و خراپ، تەڕ و وشک، وە هەمووی هەژمار کرد لە لوح المحفوظ.**

**پاشان فەرمووی : ئەگەر دەتانەوێت ئایەتی : (هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) (الجاثية : ٢٩) بخوێننەوە، جا ئایا ئیستنساخ - لەبەرگرتنەوە - لە هیچ شتێکدا دەبێت جگە لەوەی کە تەواو بووە؟. )**

**رواه الفريابي في كتاب القدر**

**ئایەتەکە دەفەرموێت : ئەمە کتابەکەتانە کە سەبارەت بە ئێوە ڕاستیەکان دەڵێت، ئێمە لە دونیادا هەموو کار و کردەوەکانی ئێوەمان ئیستنساخ دەکردەوە.**

**جا بیر بکەرەوە ڕەحمەتت لێبێت ئەگەر شتێک خۆی نەنوسرابێتەوە چۆن ئیستنساخ دەکرێتەوە؟**

**ڕوونتری بکەمەوە؛ و لله المثل الأعلی؛ بۆ نمونە من نامەیەک دەنووسم و بە تۆ دەڵێم ئەم نامەیەم بۆ ئیستنساخ بکەرەوە، دەی ئایا هەتاکو من نامەکە نەنوسم تۆ دەتوانی ئیستنساخی بکەیتەوە؟**

**بێگومان ناتوانیت؛ چونکە جارێ نەنوسراوەتەوە؛ قەدەری ئێمەش بەو شێوەیە هەمووی نوسراوەتەوە و مەلائیکەتەکانی سەرشانمان ئیستنساخی دەکەنەوە.**

**-لە فەرموودەیەکی تری صحیحدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت :**

**( الله لەسەر نەوەی ئادەم بەشی خۆی نوسیوە لە زینا، هەر پێی دەگات بە بێ هیچ گومانێک، جا زینای چاو نەزەرە، وە زینای زمان قسەیە، وە نەفسیش خۆزگە دەخوازێ و شەهەواتی هەیە، جا داوێن یان بە ڕاستی دەخاتەوە یان بە درۆی دەخاتەوە.)**

**بڕوانە صحيح البخاري : فەرموودەی ٦٦١٢**

**واتە الله تعالى لەسەر نەوەکانی ئادەم بەشێک لە زینای داناوە و هەر دەیکەن بە بێ گومان، جا بە نەزەر بێت یان بە قسەی حەرام، ئیتر یان ئەوەتا بە داوێن زیناکە ئەنجام دەدات یان ئەنجامی نادات.**

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:**

(ئادەم و موسا عليهما السلام لە لای پەروەردگاریان گفتوگۆیان کرد، موسا پێی فەرموو : تۆ ئەو ئادەمەیت کە هەڵەکەت دەری کردیت لە بەهەشت؟! ئادەمیش پێی فەرموو : تۆ ئەو موسایەیت کە الله بە پەیامەکەی و کەلامەکەی هەڵیبژاردیت، پاشان دێیت لۆمەم دەکەیت لەسەر کارێک کە لەسەرم تەقدیر کرابوو پێش ئەوەی دروست بکرێم؟ !

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئادەم دوو جار بە بەڵگە سەرکەوت بەسەر موسادا. (

بڕوانە صحيح البخاري : فەرموودەی ژمارە ٣٤٠٩

ئەم فەرموودەیەش صحیحە و لە صحیحی موسلیمدا بە ژمارە (٢٦٥٢) بە درێژتر هاتووە، موسا لۆمەی ئادەمی کرد بەڵام ئادەم فەرمووی پێش ئەوەی دروست بکرێم لە قەدەرم نوسرابوو کە ئەو هەڵەیە دەکەم.

لێرە مەبەستی ئادەم ئەوە نیە کە خەتای ئەو نەبووە چونکە ئەگەر مەبەستی ئەوە بوایە ئەسڵەن هەر تەوبەی نەدەکرد، وە دروستیش نیە کە هەڵەیەکت کرد بڵێی خەتای من نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کارێکە و الله تعالی ویستویەتی ڕوو بدات ئیتر لۆمەم مەکە چونکە تەوبەم لێی کردووە.

باسەکە کۆتایی پێ دەهێنم بەم دوو وتەیەی ابن عباس رضي الله عنه کە دەفەرمووێت:

(هەموو شتێک بە قەدەرە، تەنانەت دانانی دەستیشت لەسەر ڕوومەتت. )

-هەروەها دەفەرمووێت:

(خۆپاراستن ڕێگر نابێ لە قەدەر، بەڵام دوعا قەدەر دوور دەخاتەوە (والله اعلم، واتە دەیگۆڕێت)

بڕوانە الشريعة لاجري: ژمارە ٥٢٦ و ٥٣٢

ان شاء الله لە داهاتوودا ئەو تاقمانەتان پێ ئەناسێنین کە لە بارەی قەدەرەوە گومڕابوون، و هەڵوێستی سەلەفیش لە بارەیانەوە دەخەینە ڕوو.

#پۆستی : (٧٤)

## ئاگاداری

السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ

حمد بۆ الله تعالی کە یارمەتیداین تا ئێرە بەردەوام بین لە قۆناغی یەکەمی خولەکە، سەرەتا وتمان کە خولەکە سێ مانگی پێ ئەچێت، بەڵام بەهۆی هەندێک هۆکارەوە زیاتر لە سێ مانگی پێ ئەچێت، پێشتر ئەو پۆستانەی ئامادەبوو تەنها بەشی ئەوەندەی ئەکرد، بەڵام الحمدلله ئێستا پۆستی زیاتر ئامادەکراوە دەربارەی عەقیدەی سەلەف رحمهم الله، هەربۆیە درێژە ئەدەین بە قۆناغی یەکەم بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز، ئەوانەی ئەیانەوێت بەردەوام بن با بەم شێوەیە بکەن:

**١ - هەر بەڕێزێک تا ئێستە هەموو پۆستەکانی قۆناغی یەکەمی خوێندووەتەوە (کە ٧٤ پۆستە) با بڕواتە قۆناغی دووەم و دەست بکات بە خوێندنەوەی نامیلکەکانی قۆناغی دووەم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پۆستانە بخوێنێتەوە کە لە قۆناغی یەکەم دائەنرێت لە داهاتوودا إن شاء الله تعالى.**

**٢ - ئەو بەڕێزانەی کە هەموو پۆستەکانیان نەخوێندووەتەوە، یان کەم کەم خوێندوویانەتەوە، ئەوە با لە سەرەتاوە هەتا پۆستی ٧٤ بخوێننەوە ئینجا بڕۆنە قۆناغی دووەم، وە کە چوونە قۆناغی دووەم با هەر بەردەوام بن لە خوێندنەوەی ئەو پۆستانەی کە لە قۆناغی یەکەم دائەنرێت.**

**٣ - وەکو پێشتر ڕۆژی جارێک یان دوو ڕۆژ جارێک لە قۆناغی یەکەم پۆست ناکرێت، هەرکاتێک ئامادەبوو ئەوکاتە دائەنرێت، لەوانەیە پێنج ڕۆژ جارێک بێت، یان هەفتەی جارێک.**

**پەنجە بنێ بەمەدا (قۆناغی دووەم) بۆ چوونە قۆناغی دووەم.**

**لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن.**

@FergaySU10

@FergaySU20

## شەفاعەت : (١)

**یەکێک لەو شتانەی کە بەڵگەی ئایەت و فەرموودەی لەسەرە و سەلەفیش تەئکیدیان لێی کردووەتەوە و فەرمانیان بە خەڵکی کردووە بڕوای پێ بهێنن بابەتی شەفاعەتە ، شەفاعەتیش بە واتای تکا کردن دێت.**

**حەربی کرمانی (٢٨٠ هـ) دەڵێت:**

**شەفاعەت لە ڕۆژی قیامەتدا حەقە.**

**بڕوانە كتاب السنة : ژمارە ٤٤**

**جا شەفاعەت کردن دوو مەرجی هەیە:**

**١ - پێویستە الله تعالى ئیزن بداتە کەسی شەفاعەتکار ئینجا بۆی هەیە شەفاعەت بکات، بەبێ ئیزنی الله تعالى کەس بۆی نیە شەفاعەت بکات.**

**٢ - شەفاعەت بۆ کەسێک دەکرێت کە الله لێی ڕازی بێت، ئەو کەسەی الله لێی ڕازی نەبێت کەس ناتوانێت شەفاعەتی بۆ بکات ئەگەر بۆشی بکات ئەوا هیچ سوودی نیە.**

**-هەروەکو الله فەرموویەتی :** ( يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا)**(طه : ١٠٩)**

**واتە : لەو ڕۆژەدا کە شەفاعەت وەرناگیرێت و بێ سوودە، مەگەر لە کەسێک کە الله عز وجل ئیزنی پێ بدات بە شەفاعەت و ڕازی بێت بە قسەی.**

-وه فەرموویەتی : ( مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ ) (البقرة : ٢٥٥)

واتە : هیچ کەسێک ناتوانێت شەفاعەت بکات لە لایە الله مەگەر بە ئیزنی الله نەبێ کە ئیزن بدات بۆ شەفاعەتکار و شەفاعەت بۆ کراو.

-وه فەرموویەتی( وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ) (النجم : ٢٦)

واتە : وە چەندەها فریشتە لە ئاسمانەکاندا هەن شەفاعەتیان هیچ سوودی نییە مەگەر دوای ئەوەی کە الله ئیزن بدات بۆ کەسێک کە خۆی بیەوێت و ڕازی بێت.

-هەروەها فەرموویەتی : ( وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ )(الأنبياء : ٢٨)

واتە : شەفاعەت بۆ هیچ کەس ناکەن تەنها مەگەر بۆ ئەو کەسە نەبێت کە الله لێی ڕازی بێت.

#پۆستی : (٧٥)

## شەفاعەت : (٢)

### شەفاعەت لە قیامەتدا دوو جۆرە:

یەکەمیان تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ، دووەمیان پێغەمبەر ﷺو جگە لەویش بەشدارن تێیدا.

ئەو شەفاعەتەی تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ دەکرێت بە چەند بەشێکەوە:

١ - شەفاعەتی گەورە (العظمى) ئەویش شەفاعەت کردنە لەلای الله کە حوکم بکات لە نێوان بەندەکانی دوای ئەوەی زۆر ڕادەوەستن، ئەم شەفاعەتەیە کە هیچ پێغەمبەرێک خۆی ناکات بە خاوەنی.

-ئادەمی کوڕی علي وتی : گوێم لە ابن عمر بوو رضي الله عنه دەیفەرموو : (خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بەش بەش دەبن، هەر ئوممەتەو شوێنی پێغەمبەرەکەی خۆی دەکەوێت، دەڵێن: ئەی فلان شەفاعەتمان بۆ بکە، تاوەکو وای لێدێت شەفاعەت دەگات بە پێغەمبەر ﷺ، ئەوەش ئەو ڕۆژەیە کە مەقامی محمودی پێ دەبەخشێت) دەبەخشرێت.

بڕوانە صحيح البخاري : فەرموودەی ژمارە ٤٧١٨

:لەو ڕۆژەدا خەڵکی لە هەر ئوممەتێک داوا لە پێغەمبەرەکەیان دەکەن تاوەکو شەفاعەتیان بۆ بکات، کەس نایکات تاوەکو داواکە دەگاتە بە پێغەمبەر ﷺ، وە مەقامی محمودیش لە ئایەتی [الإسراء : ٧٩] هاتووە، ان شاء الله لە داهاتوودا بە تایبەتی باسی دەکەین.

٢ - شەفاعەت کردن بۆ ئەهلی بەهەشت کە بچنە ناو بەهەشتەوە و دەرگای بەهەشت بکرێتەوە .

-پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (من یەکەم کەسم لە بەهەشتدا شەفاعەت دەکەم، وە من لە ناو پێغەمبەراندا زۆرترین شوێنکەوتووم هەیە)

-پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (لە رۆژی قیامەتدا دێمە لای دەرگای بەهەشت، دواتر داوای کردنەوەی دەکەم، دەرگاوانەکە دەڵێت: تۆ کێیت؟ دەڵێم: محمد م، دەڵێت: فەرمانم پێکراوە پێش تۆ بۆ کەسی تری نەکەمەوە. )

بڕوانە صحیحی مسلم : فەرموودەی ژمارە ١٩٦ و ١٩٧.

٣ - شەفاعەت کردن بۆ کەسانێک لە ئوممەتی کە بەبێ لێپرسینەوە بچنە بەهەشتەوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (دێمە ژێر عەرش و دەکەومە سوجدەوە بۆ پەروەردگارم پاشان الله دەروم لێ دەکاتەوە و سوپاسگوزاریەکم فێر دەکات کە پێش من فێری کەسی نەکردووە، پاشان دەفەرمووێت: ئەی محمد سەرت بەرز بکەرەوە، داوا بکە پێت دەدرێت، شەفاعەت بکە شەفاعەتت وەڵام دەدرێتەوە.

سەرم بەرز دەکەمەوە سێ جار دەڵێم : پەروەردگارا ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم! پاشان دەوترێت : ئەی محمد، لە ئوممەتەکەت کەسانێک بکە بەهەشتەوە کە هیچ لێپرسینەوەیان لەسەر نییە)

بڕوانە کتێبی التوحيد لابن خزيمة : لاپەڕە ٣٥٨.

فەرموودەکە دوور و درێژە من تەنها ئەوەندەم نەقڵ کردووە.

٤ - شەفاعەت کردن بۆ أبو طالب ی مامی کە سزاکەی سووک بکرێت.

-عباسی کوڕی عبدالمطلب رضي الله عنه پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری الله، ئایا هیچ سوودت بە ابو طالبی مامت گەیاند؟ چونکە ئەو پارێزگاری لێت دەکرد و لەبەر تۆ توورە دەبوو.

فەرمووی : (بەڵێ، ئەو لە کۆتایی ئاگردایە [واتە بەشی سەرەوەی], ئەگەر من نەبوومایە ئەوا لە چینی خوارەوەی ئاگر دەبوو)

بڕوانە صحیحی البخاري : فەرموودەی ژمارە ٦٢٠٨.

ئەم شەفاعەتانە تایبەتن بە پێغەمبەر ﷺ کەسی تر مافی نیە بیکات، ان شاء الله دواتر باسی جۆری دووەمی شەفاعەت دەکەین.

#پۆستی : (٧٦)

## شەفاعەت : (٣)

ئەو شەفاعەتەی کە کەسانی تریش بەشدارن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چەند جۆرێکن:

١ - دەرهێنانی ئەو موسڵمانانەی کە لە دۆزەخن، لەمەیاندا فریشتەکان و ئیماندارانیش بەشدارن.

-پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (کۆمەڵێک بە شەفاعەتی من دێنە دەرەوە لە ئاگر دوای ئەوەی کە ئاگر رەنگی گۆڕیون [واتە بەهۆی سووتانەوە], دەچنە بەهەشتەوە، و ئەهلی بەهەشتیش پێیان دەڵێن : جەهەننەمییەکان)

بڕوانه صحيحى البخاري : فەرمووده‌ی ژماره ٦٥٥٩

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (وه كاتێک بينيان ڕزگاريان بووه، دەربارەی براكانيان دەڵێن: پەروەردگارا! براكانمان لەگەڵ ئێمه نوێژيان دەكرد، و ڕۆژوويان دەگرت و كردەوەيان لەگەڵمان دەكرد.

بۆيه الله تعالى دەفەرمووێت : بڕۆن هەر كەسێكتان دۆزيەوه مسقاڵە دينارێک ئيمان له دڵيدا هەبوو دەريبێنن

بڕوانه صحيحى البخاري : فەرمووده‌ی ژماره ٧٤٣٩

ئەم فەرموودەيەی دووەميان دوور و درێژه تەنها ئەوەندەم لێی هێناوه، وه فەرموودەی يەكەم كه باس لەوه دەكات ئەهلى بەهەشت پێيان دەڵێن جەهەننەمييەكان مەبەستيان تانه دان نيه لێيان، بەڵكو تەنها يادكردنەوەيەكه كه الله تعالى ڕەحمى پێكردوون و له جەهەننەم دەرى كردوون، والله اعلم.

٢ - شەفەعات كردن بۆ موسڵمانێک كه شايستەی دۆزەخه بەڵام بەهۆی شەفاعەتى ئيمانداڕانه ناچێته دۆزەخەوه.

-پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (شەفاعەتەكەم بۆ ئەهلى تاوانه گەورەكانه له ئوممەتەكەم. )

بڕوانه السنن لأبي داود : فەرمووده‌ی ژماره ٤٧٣٩

تاوانه گەورەكان بريتين له كوشتنى ناحەق و زينا و دزی و مەی خواردنەوه . . . هتد، كه ئەمانه هيچيان كوفر نين بەڵكو تاوانى گەورەن، مەبەستى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەو كەسانەيه كه ئەم تاوانانەيان كردووه و شايستەی چوونه ناو دۆزەخن چونكه تاوانەكانيان زياتره له چاكەكانيان، بەڵام به هۆی شەفاعەتى پێغەمبەرەوه صلى الله عليه وسلم ناچنه دۆزەخ.

-هەروەها پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (هيچ موسڵمانێک نيه بمرێت و ٤٠ پياو له موسڵمانان نوێژ لەسەر جەنازەكەی بكەن كه هيچ شەريک بۆ الله بڕيار نادەن، ئيللا الله شەفاعەتيان قبوڵ دەكات. )

بڕوانه صحيحى مسلم : فەرمووده‌ی ژماره ١٥٧٧.

نوێژی مردوو داوای لێخۆشبوونى تێدايه بۆ مردووەكه، جا ٤٠ موسڵمان نوێژ لەسەر موسڵمانێک بكەن ئەوا دوعاكەيان بۆ ئەو موسڵمانه قبوڵ دەبێت، والله اعلم.

٣ - بەرز كردنەوەی پلەی ئيمانداران له بەهەشتدا به شەفاعەت كردنيان بۆ يەكتر.

-الله تعالى دەفەرمووێت : (وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ )(الطور : ٢١)

واته : ئەوانەی ئيمانيان هێناوه و نەوەكانيشيان به ئيمان شوێنيان كەوتوون به يەكيان دەگەيەنين وه هيچ له كردەوەی باوانيان كەم ناكەينەوه هەموو كەسێک بارمتەی كاری خۆيەتى.

**لێرەدا الله عز وجل باس لە گەیشتنەوەی ئیمانداران دەکا بە یەکتر، باس لەوە دەکا کە لە کردەوەی باوانیان کەم ناکاتەوە تاکو بگەن بە منداڵەکانیان کە کردەوەیان کەمترە، بەڵکو بە هۆی ئەوانەوە پلەی نەوەکانیشیان بەرزتر دەکاتەوە، والله اعلم.**

**-پێغەمبەر ﷺ دوعا بۆ ابو سلمة دەکات کاتێک وەفات دەکا، دەفەرمووێت : (اللهم لە ابو سلمة خۆش بە و پلەی بەرز بکەرەوە و لەگەڵ ئەو کەسانە داینێ کە هیدایەتت داون. )**

**بڕوانە صحیحی مسلم : فەرموودەی ژمارە ١٥٢٨.**

**#پۆستی : (٧٧)**

**شەفاعەت تەنها لە الله تعالی داوا دەکرێت، واتە تەنها دەبێت لە الله عز وجل بپاڕێیتەوە بتخاتە بەر شەفاعەتی شەفاعەتکاران نەک لە خودی شەفاعەتکارەکە بپاڕێیتەوە و داوای لێ بکەی، چونکە ئەو کات دەبێتە شیرکی گەورە.**

**جا لەوانەیە پرسیارێک دروست بێت لاتان بڵێن گەر شەفاعەت تەنها لە الله داوا ئەکرێت و لە کەسی شەفاعەتکار داوا ناکرێت، ئەی چۆن خەڵکی لە ساحەی مەحشەر ئەڕۆن داوای شەفاعەت لە پێغەمبەران ئەکەن تاکو داوا کردنەکە دەگات بە پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئەمە داوا کردنی شەفاعەت نیە لێیان؟**

**لە وەڵامدا دەڵێین داوا کردنی شەفاعەت لە کەسی زیندوو کە توانای هەبێت و ئەهلی شەفاعەت بێت (وەکو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام) هاوشێوەی تەوەسولی شەرعی وایە، هەروەکو چۆن لە دونیادا موسڵمانێکی ئەهلی خێر ئەبینی پێی ئەڵێی دوعام بۆ بکە الله شیفام بدات یان منالّمان پێ بدات و هاوشێوەی ئەمانە.**

**ئەمانە دروستن لە شەرعدا هاوەڵانیش لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ داوایان لێیکردووە، واتە کەسەکە لە لای خۆتە و غائب نییە و گوێی لێتە تۆ داوای لێ دەکەی ئەمەیان شیرک نییە.**

**بەڵام دوای مردنی کەسەکە داوای شەفاعەتی لێبکرێت یان داوای هەر شتێکی لێ بکرێت دەبێتە شیرک، بۆیە کەسی زیندوو کە لە لاتە جیاوازە لەگەڵ کەسی مردوو، لە قیامەتدا خەڵکی و پێغەمبەران زیندوون و ڕووبەڕوون بەڵام لە ئێستادا پێغەمبەران مردوون هاوارکردن لێیان و داواکردن لێیان شیرکە.**

**هەروەکو چۆن تەوەسول بە داوا کردنی دوعا لە کەسێک لەکاتی زیندوو بوونی دروستە بەڵام دوای مردنی ئەبێتە شیرک ئەمەش ئاوایە، بۆیە ئەبینین عکاشة رضي الله عنه داوا لە پێغەمبەر ﷺ کە داوای بۆ بکات لای الله لەو ٧٠ هەزار کەسە بێت کە بە بێ حیساب ئەچنە بەهەشتەوە، ئەمەش داواکردنی شەفاعەتە لێی لە دونیا.**

**پرسیارێکی تریش لەوانەیە بێتە پێشەوە؛ ئەویش ئەوەیە کە وتمان ئیماندارانیش لە قیامەت شەفاعەت دەکەن؛ دەی ئایا ئەگەر کەسێک زیندوو بێت ئەکرێ داوای لێبکەین لە قیامەت شەفاعەتمان بۆ بکات؟**

**لە وەڵامدا دەڵێین ئێمە نازانین کێ لە قیامەت شەفاعەت دەکات تاکو داوای لێ بکەین، کەس هەیە بڵێ من بەڵێنم پێدراوە کە لە قیامەت شەفاعەت ئەکەم تاکو خەڵک داوای لێبکات؟ ئەوەی دیاریکراوە تەنها پێغەمبەرە ﷺ بۆیە لە بابەتی شەفاعەت تەنها باسی ئەو ئەکرێت کە نابێ داوای لێبکرێت .**

هەرچەندە هەندێک لە سۆفیە موشریکەکان شەفاعەتیان داوە بە کۆمەڵێک لە شێخە گومڕاکانیان ئەڵێن ئەمانە شەفاعەت ئەکەن بۆمان هاوشێوەی موشریکانی قوڕەیش کە شەفاعەتیان دابوویەوە بتەکانیان بە بێ بوونی هیچ بەڵگەیەک لای الله.

#پۆستی : (٧٨)

## بەهەشت و دۆزەخ

بەهەشت و دۆزەخ بەووشەوە کە لە ناویاندا هەیە هەرگیز لە ناو ناچن و بەردەوامن، ئەمە کۆدەنگی هەموو زانایانی سەلەفی لەسەرە.

-إبن بطة (٣٨٧ هـ) دەڵێت:

پاشان ئیمان هێنان بەوەی کە الله عز و جل بەهەشت و دۆزەخی دروست کردووە پێش دروستکردنی دروستکراوەکان.

وە نیعمەتەکانی بەهەشت هەرگیز لاناچن و بەردەوامن و هەتاهەتایە لە خۆشی و خۆشگوزەرانیدان.

وە هاوسەرەکانیان لە حۆریە چاو گەشەکانن؛ نامرن، و لێیان کەم نابێتەوە [واتە لە جوانیەکەیان، والله اعلم], وە پیر نابن، وە بەر و بووم و نیعمەمەتەکانی بەهەشت نابڕێنەوە، هەروەکو الله عز و جل فەرموویەتی (أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا) [الرعد : ٣٥]

بەڵام سزای دۆزەخ : بەردەوامە بە بەردەوامی الله، وە ئەهلەکەی تێیدا نەمرن و هەتاهەتایە تێیدا دەمێننەوە کە کەسانێکن لە دونیا دەرچوونە و لە بیروباوەڕیدا تەوحیدیان نەبووە، و دەستیان بە سوننەتیش نەگرتووە.

ئەمما یەکخواپەرستان : بە شەفاعەت لێی دێنە دەرەوە.

بڕوانە الإبانة الصغرى : ٢٧٤

بیروباوەڕی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی لە دونیادا کوفری گەورەیان ئەنجامداوە و بە بێ تەوبە گەڕاونەتەوە لای الله عز وجل هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەبن و سزا دەدرێن، بەڵام ئەو موسڵمانانەی کە بە تاوانی گەورە گەڕاونەتەوە لای الله تعالى ئەوا بە پێی ویستی خۆیەتی یان ئەوەتا الله عز وجل لێیان خۆش دەبێت یان ئەوەتا سزایان دەدات و دواتر بە هۆی شەفاعەتەوە لە دۆزەخ دێنە دەرەوە.

ڕاستە هەندێک لە هاوەڵان باسیان لەوە کردووە کە ڕۆژێک دێت دەرگاکانی جەهەننەم دادەخرێن و کەسی تێدا نامێنێ، بەڵام لێرەدا مەبەستیان لە موسڵمانان بووە نەک کافران.

-عبدالله ی کوڕی عمرو رضي الله عنه فەرمووی:

ڕۆژێک دێت بەسەر جەهەننەمدا دەرگاکانی دابخرێت، و کەسی تێدا نەمێنێ، ئەمەش دوای ئەوەیە کە ماوەیەکی زۆر تێیدا ماونەتەوە.

بڕوانە كتاب السنة لحرب الكرماني : ٤٤٠

حەرب (٢٨٠ هـ) دەڵێت :

گوێم لە أبا عبداللە محمدی کوڕی نضر الفرَّاء بوو وتی : جار لە دوای جار پرسیارم کرد لە سلیمانی کوڕی حرب، و عبیداللە ی کوڕی محمد التیمي و أبا عبید، وتیان : دۆزەخ ناوەوە و ڕووکەشی هەیە، ئەهلی تەوحید بەو شوێنە ناچنە ژوورەوە کە ئەهلی کوفر و نیفاق پێیدا دەچن، لەبەر ئەوەی هەرکەس لە شوێنی ئەهلی کوفر و نیفاقدا بچێتە ژوورەوە هەرگیز نایەتە دەرەوە، ئایا گوێت لەم فەرمایشتەی الله تعالی نەبووە کە دەفەرمووێت : (لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى (١٥) ٱلَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ) [اللیل ١٥ - ١٦] عەرەبیش بە مەڕ ناڵێن مصلی ئیللا ئەوە نەبێت کە لە ناوەڕاستی پشکۆدا دەبرێژندرێت، چاڵێک هەڵدەکەنن لەزەویدا، پاشان پشکۆیەکی زۆری تێدا کۆدەکەنەوە، پاشان ئەوەی کە پێستەی داماڵیوە دەیخەنە ناوەڕاستی ئەو پشکۆیانە هەتاوەکو تێیدا ون دەبێت، وە تێیدا دەبرژێت، ئا ئەمەیە مصلی لەلایان، ئەمما ئەوانەی لەسەر پشتی پشکۆ دەبرژێندرێن یان سوورەوەکراو یان لەناو تەندوور پێی ناڵێن مصلی.

وتیان : مانای فەرموودەکە : ئەوەیە کە ئەهلی تەوحید لەو شوێنەوە ناچنە ناوەوە کە ئەهلی کوفر و نیفاق پێیدا دەچن، کە ئەویش ناوسک و ناواخنی ئاگرە و خوارەوەیەتی، الله تعالی دەفەرموێت : (إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ) (النساء : ١٤٥)

واتە : بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خوارەوەی دۆزەخدان.

جا ئەم ئاگرە ئامادەکراوە بۆ کافرەکان .

هەروەها مانای فەرموودەی شەفاعەت ئەوەیە : (هەر کەس بەئەندازەی تۆوێکی خەردەل ئیمانی لە دڵدا بێت دێتە دەرەوە لە ئاگر)، مانای ئەوەیە : دێنە دەرەوە لە ڕووکەشی ئاگر .

أبو عبداللە [واتە ئیمام أحمد (٢٤١ هـ)] وتی : وایدەبینین کە فەرموودەکەی عبداللە ی کوڕی عمرو رضي الله عنه ئەگەر ئەسڵ و بنچینەی هەبێت مانای ئەوەیە : کاتانێک دێت بەسەر دۆزەخدا کە هیچ کەسێکی تێدانیە، بەڕاستی ئا ئەوە شوێنی ئەهلی تەوحیدە .

وە الله تعالی فەرموویەتی : { خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ} هود : ١٠٧).

واتە : تا ئاسمانەکان و زەویی هەبن، ئەوانیش تێیدا دەمێننەوە بۆ هەمیشە، مەگەر پەروەردگارت ویستی (گۆڕانکاری) هەبێت.

جا جیاکاریەکە لای ئێمە دەکەوێتە سەر ئەهلی تەوحید، لە هەردوو ئایەتەکەدا، دوای ئەوەی کە شەفاعەت بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ئەوانەی کە تاوان دەکەن، ئەمەیە کە تەفسیرمان کرد، والله اعلم .

بڕوانە کتاب السنة : ٤٤٣

کەواتە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە بەو شێوەیە کە موسڵمانان دێنە دەرەوە لە دۆزەخ بەڵام کافران و مونافیقان هەتاهەتایە تێیدا دەمێننەوە، والله اعلم.

**الله تعالى پەنامان بدات لە حاڵ و شوێنی کافران و مونافیقان.**

**#پۆستی : (٧٩)**

**حەوز، صراط، تەرازوو، سزای گۆڕ، منكر و نكير**

**موسڵمان دەبێ بڕوایەکی تەواوی بەو شتانە هەبێت کە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هاتوون و زانایانی سەلەف وەریان گرتووە، شتانێکی وەکو حەوز و تەرازوو و پردی صراط و سزای گۆڕ هەروەها ئەو دوو مەلائیکەتەی لە گۆڕدا پرسیار دەکەن کە ناویان منكر و نكير ـە.**

**-الله عز وجل دەفەرمووێت :** (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ) **(طه : ١٢٤).**

**واتە : هەر کەس پشتی لە یادی من کرد ئەوا ژیانێکی تاڵی دەبێت و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین.**

**-ابن بطة (٣٨٧ هـ) دەربارەی(** فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا **)دەڵێت : هاوەڵانی تەفسیر دەڵێن: مەبەستی سزای گۆڕە.**

**-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (پەنا بگرن بە الله لە سزای گۆڕ)**

**-وەفەرموویەتی : (مردوو لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێنرێت)**

**بڕوانە الإبانة الصغرى : ٢٦١ و ٢٥٨ و ٢٥٩.**

**-وە فەرموویەتی : (کاتێک کە بەندە مرد، دوو مەلائیکەتی ڕەش و شین دێنە لای بە یەکێکیان دەوترێ : منكر و بەوەی تریان دەوترێ نكير)**

**بڕوانە سنن الترمذي : ١٠٧١.**

**هەروەها الصراط کە پردێکە لەسەر جەهەننەم دادەنرێ و خەڵکی بەسەریدا دەپەڕنەوە بۆ بەهەشت، هەندێکیان ناتوانن بپەڕنەوە و دەکەونە خوارەوە.**

**-پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پردی صراط دەفەرمووێت : (تیژترە لە شمشێر، و باریکترە لە موو)**

**-ابن بطة دەڵێت : پاشان ئیمان هێنان بە زیندووبوونەوە و صراط، وە شیعاری ئیمانداران لەو ڕۆژەدا بریتیە لە : پەروەردگارا سەلامەتمان کە سەلامەتمان کە.**

**بڕوانە الإبانة الصغرى : ٢٦٥ و ٢٦٤.**

**-ابن بطة دەڵێ: پاشان ئیمان هێنان بە تەرازووەکان، هەروەکو الله عز وجل فەرموویەتی :** (وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ) **(الانبياء : ٤٧)**

**واتە : لە ڕۆژی قیامەت تەرازووەکانی دادپەروەری دادەنێین.**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (تەرازوو بە دەستی الرحمن ـە، نزمی دەکاتەوە و بەرزی دەکاتەوە)

إبن بطة دەڵێت : هەر کەس گومانی لەمە هەبوو یان بە درۆی خستەوە ئەوا گەورەترین ئیلحادی ئەنجامداوە.

بڕوانە الإبانة الصغرى : ٢٦٦ و ٢٦٨.

-هەروەها سەبارەت بە حەوز پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (حەوزێکم هەیە بە مەودای نێوان ئەیلە و عەدەن. )

إبن بطة دەڵێت : مەبەستی ئەوەیە ئەندازەکەی هێندەی نێوان شاری ئەیلە و عەدەنە.

بڕوانە الإبانة الصغرى : ٢٧٠.

ئەمانە و زۆرێکی تریش هەن کە زانایان گێڕاویانەتەوە و کۆدەنگیان لەسەری هەبووە، کەسیان لە خۆیەوە تەفسیری ئەمانەی نەکردووە، بۆ نمونە وەکو گومڕاکان نەیانوتوە کە تەرازوو مەبەست لە عەدلی الله یە، ڕاستە الله عەدلی هەیە بەڵام تەرازوو شتێکی ترە و لە ڕۆژی قیامەت دادەنرێت.

ئێمەی موسڵمانیش بۆمان نییە بەمانە و هاوشێوەکانیان بڵێین نامەعقول و بە درۆیان بخەینەوە، ئەی کە ئێمە تەسلیمی ئەو هەواڵانە نەبین کە لە الله عز وجل و پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ هاتوون و زانایانیش کۆدەنگن لەسەری، کەواتە ئێمە چۆن ناو لە خۆمان بنێین مسلم؟!

الله تعالى هیدایەتی هەموو لایەکمان بدا و لە سزای گۆڕ و دۆزەخ بمانپارێزێت و تای تەرازووی چاکەکانمان قورس بکات.

#پۆستی : (٨٠)

قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نییە

سەرەتا ئەگەر ڕوونکردنەوە لە بارەی وشەی | مەخلوق | ـەوە بدەین، مەخلوق بریتیە لەو شتەی کە پێشتر بوونی نەبووە و دواتر هاتووەتە بوون و دروستکراوە، بۆ نمونە من هەر چەندە بە تەمەن بم ئەوا کاتێک هەبووە کە من بوونم نەبووە، واتە ئەگەر شتێک تەمەنی ١٠٠ ساڵیش بێت ئەوا پێش ١٠١ ساڵ ئەو شتە بوونی نەبووە.

بەڵام الله تعالى لە ئەزەلەوە بوونی هەبووە و هەمیشە هەر هەبووە بە هەموو سیفاتەکانیشیەوە، قورئانیش لە سیفاتی الله یە و کەلامیەتی، ئەگەر بڵێیت مەخلوقە ئەوا کافر دەبیت چونکە تۆ پێت وایە الله تعالى پێشتر نەیتوانیوە قسە بکات دواتر کەلامی بۆ خۆی دروست کردووە، هەروەها قورئان لە عیلمی الله یە هەروەکو الله عز وجل دەفەرمووێت:

( وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ) (البقرة : ١٢٠)

واتە : ئەی محمد ﷺ ئەگەر تۆ شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت دوای ئەوەی ئەم عیلمەت بۆ هات ئەوا لە لایەن الله ـوە هیچ یارمەتیدەر و سەرخەرێکت نابێت.

لێرەدا مەبەستی لە عیلم قورئانە، کە تۆ دەڵێی قورئان مەخلوقە واتە عیلمی الله تعالی مەخلوقە، ئەم قسەیەش پەنا بە الله عز وجل مانای وایە الله پێشتر بێ عیلم و نەزان و جاهیل بووە دواتر عیلمی بۆ خۆی دروست کردووە!!!

جا نەک تەنها سیفەتی عیلم و کەلام بەڵکو بۆ هەموو سیفاتەکانی تری الله تعالی دەبێت بە بێ شک بڕوات وابێت کە هیچیان مەخلوق نین و تازە و داهێنراو نین.

هەروەها نابێت بوەستیت لەوەی کە بڵێی مەخلوق نیە، واتە ناتوانی بڵێی: من دەڵێم قورئان کەلامی الله یە، بەڵام نە دەڵێم مەخلوقە نە دەڵێم مەخلوق نییە. ئەمەشیان بە هەمان شێوە کوفرە چونکە نابێ گومانت لە مەخلوق نەبوونی هیچ کام لە سیفاتەکانی الله عز وجل هەبێت.

-هەروەکو ابن بطة (٣٨٧ هـ) دەڵێت:

پاشان لە دوای ئەوە بزانیت بە بێ گومان و دوو دڵی و لێ وەستان: کە قورئان کەلامی الله یە و وەحییەتی، و دابەزێنراویەتی، تێیدا واتاکانی بە تاک ڕاگرتنی هەیە، وە ناسینی و بەڵگەکانی و سیفاتەکانی و ناوەکانی تێدا هەیە، وە زانستێکە لە زانستەکانی و مەخلوق نییە، وە بە هەر شێوازێک خوێندرایەوە، و بە هەر شێوەیەک نوسرایەوە، و لەو کاتەش کە تیلاوە کرا، وە لە هەر بارێکدا، لە ئاسماندا بێت یاخود لە زەوی، پارێزرابێت لە لوح المحفوظ و لە پەڕاوەکاندا، وە لە لەوحەی منداڵاندا کێشرابێت، یان لەسەر بەرد نەخشێنرابێت، وە لەسەر هەموو حاڵەتەکانی و جیهاتەکانی؛ ئەوا هەر کەلامی الله یە و مەخلوقیش نییە.

أ - جا هەر کەس وتی : مەخلوقە.

ب - یان وتی : کەلامی الله یە و لێی وەستا و گومانی هەبوو .

ج - یان بە زمانی وتی، و لە نەفسی خۆیدا پێی وابوو کە مەخلوقە و شاردیەوە؛

ئەوا کافرە بە الله، خوێنی حەڵاڵە، بەرییە لە الله و الله ش لەو بەرییە.

وە هەر کەسێک گومانی لە کوفرەکەی هەبوو، و وەستا لە تەکفیر کردنی: ئەوا ئەویش کافرە بە فەرمایشتی الله عز و جل کە فەرموویەتی: (بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ (٢٢)) (البروج : ٢١ – ٢٢).

یاخود : (حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ) (التوبة : ٦)

یاخود : (ذَلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنْزَلَهُ إِلَيْكُمْ وَمَنْ) (الطلاق : ٥)

جا هەر کەس پێی وابێت کە یەک پیت لێی مەخلوقە: ئەوا کافر بووە بە بێ هیچ گومانێک.

چونکە ئایەت دەربارەی ئەوە لە قورئاندا، و بەڵگە لە المصطفی ـوە ﷺ زیاترن لەوەی کە بژمێردرێن، وە ئاشکراترن لەوەی کە بشاردرێنەوە.

بڕوانە الإبانة الصغری : ئەثەری ٢٥٠

:ئەم قسانەی ابن بطة رحمه الله بیر و باوەڕ و کۆدەنگی هەموو زانایانی سەلەفە و کەس وتەیەکی جیاوازی لەمە نەوتووە، کتێبەکانی سەلەف پڕن لە: "هەر کەس وتی قورئان مەخلوقە کافرە، و ئەوەشی تەکفیری نەکات کافرە"

واتە نەک تەنیا ئەو کەسەی دەڵێت مەخلوقە کافرە بەڵکو ئەوەی گومانیشی لە کوفرەکەی هەبێت کافرە.

جا ئەمە بیروباوەڕی سەلەف بوو لەم بابەتەدا، وە بە گشتی تەنها ئەوەندە بزانن کە هیچ سیفاتێکی الله عز وجل مەخلوق نییە.

ئیمام عثمان بن سعید الدارمي ئەڵێت:

بینیمان هەموو شتەکان دوو جۆرن: خالق بە هەموو سیفەتەکانیەوە، وە مەخلوقەکان بە هەموو سیفەتەکانیانەوە، خالق بە هەموو سیفەتەکانیەوە غەیر مەخلوقە، وە مەخلوق بە هەموو سیفەتەکانیەوە مەخلوقە.

الرد علی الجهمیة : ١٧٥-١٧٦.

#پۆستی : (٨١)

## فەزڵی هاوەڵان : (١)

یەکێکی تر لەو شتانەی کە سەلەفی صالح جەختیان لێ کردووەتەوە و بە گەورە دایان ناوە و بانگەوازیشیان کردووە کە کەسانی تریش دابی پێ دا بنێن، بریتیە لە دان نان بە فەزڵی هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ بەسەر هەموو ئەوانەی دوای خۆیاندا.

إبن بطة (٣٨٧ هـ) دەڵێت:

وە عیلمت جێگیر بێت، وە دڵنیا بە لەوەی هەر پیاوێک کە پێغەمبەری ﷺ دیبێت و شایەتی لەسەر دابێت و، ئیمانی پێ هێنابێت و، شوێنی کەوتبێت تەنانەت ئەگەر یەک کاتژمێر بووبێت لە ڕۆژدا ئەوا باشترە لەو کەسەی کە نەیدیوە، ئەگەر چی هەموو کردەوەی دروست کراوەکانیشی ئەنجام دابێت.

پاشان ڕەحمەت ناردن بۆ هەموو هاوەڵانی رضي الله عنهم : بچوک و گەورەیان، و سەرەتا و کۆتایان، وە باسکردنی باشییەکانیان، و بڵاو کردنەوەی فەزیلەتەکانیان، و پابەندبوون پێیانەوە، وە وەستان لە ئەثەرەکانیان - واتە ئەگەر ئەثەر لەوان هاتبوو کیفایەتە بۆمان - , وە حەق لە هەموو ئەوەدایە کە ئەوان فەرموویانە، و پێکانیش لەوەدایە کە ئەوان کردوویانە.

بڕوانە الإبانة الصغری : ئەثەری ژمارە ٣٢٠ و ٣٢١

لێرەوە ئەوەش دەردەکەوێ کە کێ بە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ حسابە، هەموو ئەو کەسانەی کە بە چاوی خۆیان پێغەمبەریان ﷺ دیوە هاوەڵ نین، مەرجەکە ئەوەیە کە بڕوایان پێ هێنابێت و شایەتیان پێدابێت و

شوێنی کەوتبێتن، خۆ ابو جهل یش پێغەمبەری ﷺ بینی بەڵام بڕوای پێ نەهێنا بۆیە هاوەڵی نییە بەڵکو کافرە.

جا ئەو کەسانەی کە دیویانە و بڕوایان پێ هێناوە فەزڵیان بەسەر هەموو کەسی دوای خۆیانەوە هەیە و لەو کەسانە باشترن کە نەیان دیوە، تەنانەت ئەگەر کەسێک تەنها یەک کاتژمێر هاوەڵێتی پێغەمبەری ﷺ کردبێ باشترە لەو کەسەی کە نەیدیوە ئەگەر چی هەموو چاکەیەکی دونیاش بکا، ئەمە قسەی نەفەرێک و دووان نییە ئەمە کۆدەنگی هەموو زانایانی سەلەفە و لە تێگەیشتنی خۆیانەوە بۆ قورئان و فەرموودە ئەمەیان وتووە.

هەروەها قسەکەی ابن بطة ئەوەش دەردەخات کە پێشتر باسمان کرد، هەروەکو پێشتر وتمان دین ئەبێت بە تێگەیشتنی ئەوان وەربگرین و ئەو عەقیدە و بیروباوەڕەی ئەوان هەیان بووە ئێمەش دەبێت ئەوەمان هەبێت و نابێت لێی لابدەین، بەو مانایە تێمەگەن نا کە واز لە ئایەت و فەرموودە دەهێنێن بۆ قسەی هاوەڵان بەڵکو بەو مانایەی کە ئایەت و فەرموودە بە تێگەیشتنی ئەوان وەردەگرین.

إن شاء الله لە پۆستێکی تر قسەی زیاتری لەسەر ئەکەین.

#پۆستی : (٨٢)

## فەزڵی هاوەڵان : (٢)

زانایانی ئەهلی سوننە بیر و باوەڕیان چۆن بووە دەربارەی هاوەڵان؟

پێشەوا حرب الكرماني (٢٨٠ هـ) دەڵێت:

وە لە سوننەتە ئاشکرا و ڕوون و جێگیر و زانراوەکان بریتیە لە:

٧٤ - باسکردنی باشی و جوانییەکانی هاوەڵانی رسول الله ﷺ گشتیان، وە دەست هەڵگرتن و خۆگرتنەوە لە باسکردنی هەڵەکانیان و ئەو ناکۆکیەی لە نێوانیان روویداوە.

٧٥ - هەر کەسێک جنێوی دا بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، یان یەکێک لەوان، یان لێی کەم بکاتەوە - واتە لەڕێزیان کەم بکاتەوە - ، یان تانەیان لێبدات، یان عەیبەکانیان نیشان بدات، یان یەکێک لەوان عەیبدار بکات بە کەم یان بە زۆر ، بە بچووک یان گەورە، لەو شتانەی سەر دەکێشێ بۆ جنێودان و عەیبەتکردن و عەیبدارکردنیان، ئەوا ئەو کەسە بیدعەچی و ڕافیزەیەکی پیس و پێچەوانەکارە، الله نە فەرز نە سوننەتی لێ وەرناگرێت؛ بەڵکو خۆشویستنیان لە سوننەتەوەیە، وە دوعا کردن بۆیان نزیکبوونەوەیە لە الله عَزَّوَجَل، وە کردنیان بە پێشەنگ و چاولێکردنیان وەسیلەیە، وە گرتنەبەری ڕێباز و شوێنەواریان.

بڕوانە کتاب السنة لحرب الكرماني

حرب الكرماني کۆدەنگی هەموو زانایانی پێش خۆی نەقڵ کردووە دەربارەی هاوەڵان، کە هەریەک لە ئێمە ڕێز لە هاوەڵان رضي الله عنهم بگرین و تەنها بە باشە باسیان بکەین.

-هەروەها پێشەوا حرب دەڵێت:

٨١ - بۆ هیچ کەسێک درووست نییە هیچ شتێک لە خراپیەکانیان باس بکات، وە نابێت تانە لە هیچ یەکێک لەوان بدات بە عەیبێک، وە نە بە کەموکوڕیەک، وە نە بە لەکەدارکردنێک.

هەرکەسێک ئەو کارە بکات، ئەوا واجبە لەسەر فەرمانڕەوا : تەمبێی بکات و سزای بدات، بۆی نییە لێی خۆشبێت، بەڵکو سزای دەدات پاشان داوای تەوبەی لێدەکات، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا لێی قبوڵ دەکرێت، ئەگەر تەوبەی نەکرد، ئەوا دووبارە سزا دەدرێتەوە، پاشان بەند دەکرێت بۆ هەمیشە تاوەکو تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە.

ئا ئەمە سوننەتە بەرامبەر هاوەڵانی رسول الله ﷺ.

کتاب السنة لحرب الکرماني

:والله اعلم، ئەوانەی کە تانە و توانجیان لێ ئەدەن بەوەی کە هاوەڵان گومڕابن یان کافر بن ئەوا هیچ گومانێک لە کوفریان نییە هەروەکو ئەوەی ڕافیزە پیسەکان دەیکەن، بەڵام کەسێک بە خراپە باسیان بکات ئەوەیان تەمبێ دەکرێت.

#پۆستی : (٨٣)

## فەزڵی هاوەڵان : (٣)

ئەهلی سوننە بیروباوەڕیان وایە کە هاوەڵان هەندێکیان باشترن و فەزڵیان زیاترە بەسەر هەندێکی تریانەوە

یەکەم کەس کە باشترینە لە ناو هاوەڵاندا ئەبو بکری صدیقە، پاشان عمری کوڕی خطاب، پاشان عثمانی کوڕی عفان، پاشان علي کوڕی ابو طالب رضي الله عنهم.

لە دوای ئەوان ئەو شەش کەسەی تر کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە کە بە ئەهلی شوراش ناسراون، پاشان ئەوانەی کە هیجرەتیان کرد، پاشان پشتیوانان کە خەڵکی مەدینە بوون، دواتر باقی هاوەڵان.

بۆ ئەمەش بەڵگە لە قورئان و سوننەت و ئاثاری زانایان زۆر هەیە، هەندێک لەو بەڵگانە:

ناسراوانییە - الله عز وجل فەرموویەتی : ( وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ)(التوبة : ١٠٠)

واتە : (وە پێشەنگە یەکەمەکان لە کۆچەران و پشتیوانان ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون الله لێیان ڕازییە ئەوانیش لە الله ڕازین، بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە)

-ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (٢٤١ هـ) ئەڵێت:

باشترینی ئەم ئوممەتە لە دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ ابو بکری صدیقە، پاشان عومەری کوڕی خەطاب، پاشان عوسمانی کوڕی عەففان، ئەم سیانە پێش دەخەین هەروەکو چۆن هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێشیان

خستون، کەسیان لەمەدا جیاوازیان نەبووە، پاشان لە دوای ئەم سیانە هاوەڵانی شورا باشترینن کە بریتین لە : علي کوڕی ابو طالب، طەڵحە و زوبەیر، عبدالرحمن کوڕی عەوف، سەعدی کوڕی ابو وقاص، هەموویان بۆ جێنشینایەتی باشن، وە هەموویان پێشەوان، لەم بارەیەشەوە بۆ فەرموودەی ابن عمر دەڕۆین: (ئێمە ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ زیندوو بوو وە هاوەڵانی بەردەست بوون ابو بکر و عومەر و عوسمان مان بە باشترین دەزانی پاشان بێدەنگ دەبووین.)

پاشان لە دوای هاوەڵانی شورا ئەهلی بەدر لە کۆچەران، پاشان ئەهلی بەدر لە پشتیوانان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە پێی کۆچ و پێشەنگیەتی، یەکەم بە یەکەم، پاشان باشترین کەس لە دوای ئەمانەوە خەڵکی ئەو سەردەمەن کە پێغەمبەر ﷺ تێیاندا نێردرا، وە هەر کەس هاوەڵێتی کردبێت بۆ ماوەی ساڵێک یان مانگێک یان ڕۆژێک یان سەعاتێک ئەوا بە هاوەڵی حسابە، بە پێی هاوەڵێتیەکەی هاوەڵی بۆ هەیە، پێشینە و بیستنی لێیەوە هەیە، جا ئەوەی کەمترین هاوەڵێتی کردووە باشترە لەو کەسانەی کە نەیان بینیوە، تەنانەت ئەگەر بە هەموو کردەوەکانیشەوە بگەنەوە بە الله ئەوا ئەو کەسانەی کە هاوەڵی پێغەمبەریان ﷺ کردووە و بینیویانە و لێیانەوە بیستووە باشترن، وە هەر کەس بە چاوی بینیبێتی ئیمانی پێی هێنابێت ئەگەر چی بۆ ماوەی سەعاتێکیش، ئەوا باشترە لە تابعین لەبەر ئەو هاوەڵێتیەی، ئەگەر چی تابعین هەموو کردەوەکانیش بکەن.

بڕوانە اصول السنة ی ئیمام ئەحمەد

وەکو بیرخستنەوەیەک تابعین ئەو کەسانەن کە هاوەڵانیان بینیوە بەڵام پێغەمبەریان ﷺ نەبینیوە، ئەگەر چی فەزڵی ئەمانیش گەورەیە بەڵام کەمترین هاوەڵ لە پلەدا لەوان فەزڵی زیاترە، چ جای خەڵکی ئێستە.

ئەمە بە کورتی لەسەر فەزڵی هاوەڵان، موسڵمان نابێت لە فەزڵیان کەم بکاتەوە وە نابێت باسی ناکۆکی نێوانیان بکا، وە نابێ جنێویان پێ بدا، بەڵکو دەبێ خۆشی بوێن و ڕەحمەتیان بۆ بنێرێت و دوعایان بۆ بکات و خەڵکیش فێری خۆشویستنی ئەوان بکات و دژی ئەوانە بێت کە بە جۆرێک لە جۆرەکان دژی هاوەڵانن رضي الله عنهم جميعا.

#پۆستی : (٨٤)

## ئیمانداران لە قیامەت الله تعالى دەبینن

بنچینەیەکی تر لە بنچینەکانی سوننەت کە هەر کەس بڕوای پێ نەبێت ئەسڵەن نەک ئەهلی سوننە نیە بەڵکو موسڵمان نیە، بریتیە لە ئیمان هێنان بەوەی کە ئیمانداران لە ڕۆژی قیامەت پەروەردگاری خۆیان دەبینن بە حەقیقی.

هەموو زانایانی ئەهلی سوننە لە هەموو سەردەمەکان ئەمەیان وتووە و کەس نەبووە غەیری ئەمە بڵێت ئیللا زانایان ڕەددیان داوەتەوە، هەموو زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی ئیمانداران لە قیامەت بە چاوی سەریان الله تعالى دەبینن بێ ئەوەی توشی هیچ گومانێک و نارەحەتیەک ببن، وە بەڵگەش سەبارەت بەمە لە قورئان و سوننەت و وتەی زانایانی ئەهلی سوننە زۆر زۆرە.

-الله تعالى دەفەرموێ : (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣) ) (القيامة)

واتە : لەو ڕۆژەدا ڕووخسارگەلێک پڕشنگدارن بەرەو پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن.

هەروەها سەبارەت بە کافرەکان دەفەرموێ : ( كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ) (١٥)

واتە : کافران لەو ڕۆژەدا لە نێوان ئەوان و بینینی الله تعالى ـدا حیجاب و پەردە هەیە و ئەوان ڕێگری ئەکرێن لەوەی کە الله تعالى ببینن.

جا بڕوانە الله تعالى وەکو سزایەک بۆ کافران باسی ئەوە دەکا کە الله تعالى نابینن، دەی ئەگەر ئیماندارانیش بە هەمان شێوەی ئەوان بن و نەتوانن ببینن؛ ئەوا چ فەزڵێک بۆ ئیمانداران هەیە بەسەر کافرانەوە؟

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

لە ڕۆژی قیامەت پەروەردگارتان دەبینن هەروەکو چۆن مانگ دەبینن لە شەوی چواردە کە هیچ هەورێکی لە پێش نەبێ، وە لە بینینیدا تووشی نارەحەتی نابن.

بڕوانە صحيح البخاري : فەرموودەی ژمارە ٥٤٤ و ٤٨٥١ و ٧٤٣٤ و ٧٤٣٦)

والله اعلم ١٧ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرموودەیەیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

جا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە چۆن مانگی چواردە کە پڕە و هەوریش بەردەمی نەگرتووە یان خۆر کە هەور بەردەمی نەگرتووە هەموو کەس لە جێی خۆیەوە دەیبینێ بە جوانی، ئاوا بەو شێوەیەش الله تعالى دەبینن.

مەبەستیش لەوەی توشی نارەحەتی نابن ئەوەیە کە پێویست ناکات بچنە شوێنێکی بەرز تا پەروەردگارتان ببین، بۆ نمونە بۆ بینینی مانگ لە سەرەتا و کۆتای ڕەمەزاندا پێویستە کەسانێک بچنە شوێنێکی بەرز تا مانگ ببینن وە ئەوانەی لە خوارەوەن نایبینن، لە قیامەت پێویست بەو نارەحەتیە ناکات هەموو ئیماندارێک لە شوێنی خۆیەوە دەیبینێ.

هەروەها الله تعالى دەفەرمووێت : (لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ ) (یونس : ٢٦) .

واتە : ئەوانەی کە چاکەکار بوون چاکیان بۆ هەیە لەگەڵ زیادە، جا ئەهلی عیلم لە هاوەڵان و تابعین و ئەتباعی تابعین چاکەیان بە بەهەشت لێکداوەتەوە وە زیادەکەشیان بە بینینی الله تعالى لێکداوەتەوە.

ئیمام ئەبو بکری صدیق رضي الله عنه سەبارەت بەم ئایەتە فەرموویەتی : بریتیە لە ڕوانین بۆ ڕووخساری پەروەردگاریان.

بڕوانە تەفسیری الطبري : ١٧٦١٠

ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەهلی بیدعە و گومرایی و کوفر ویستویانە خەڵکی پێ هەڵبخەڵەتێنن ئەوەبووە کە ئەم ئایەتەیان بە تێگەیشتنی خۆیان تەفسیر کردووە: ( لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ )(الأنعام: ١٠٣)

واتە : چاوەکان درک بە الله عز وجل ناکەن بەڵام ئەو درک بە چاوەکان دەکات.

زانایان ئەمەیان ڕوون کردۆتەوە و ڕایان گەیاندووە کە ئەمە لە دونیادا ڕوو دەدا، بەڵام لە قیامەت وەکو ئەوەی باسمان کرد ئیمانداران الله دەبینن.

ئیمام الدارمي (٢٨٠ هـ) دەڵێ :

پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی الله تعالى مەبەستی لەم ئایەتە چی بووە و تێگەیشتووە، جا بە وازحی تەفسیری کردووە و لێکی داوەتەوە؛ هەردوو بابەتەکەی بە تەفسیرێکی کافی شیفا بەخش تەفسیر کردووە، أبو ذر رضي الله عنه پرسیاری لێکرد: پەروەردگارت بینی ١ واتە لە شەوی ئیسرا و میعراج - ؟

فەرمووی: ئەو نورە چۆن ببینم؟

بڕوانە صحيح مسلم : ١٧٨

الدارمي دەڵێ : ئەمەش واتای ئایەتی : (لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ ) (الأنعام: ١٠٣) بریتیە لەوەی لە ژیانی دونیا نایبینن، جا کە پرسیاری لێکرا دەربارەی بینینی الله تعالى لە قیامەت، فەرمووی: (بەڵێ، بە ئاشکرا هەروەکو چۆن خۆر وە مانگ دەبینن لە شەوی چواردە)، کەواتە پێغەمبەر ﷺ تەفسیری هەردوو واتاکەی کرد بە خیلافی ئەوەی تۆ کردت.

بڕوانە کتێبی النقض ابي سعيد على المريسي العنيد : ئەثەری ٧٥ لاپەڕە ١٢٧ تا ١٣٠

لەم کتێبە ئیمام الدارمي ڕەددی ئەو کەسانە ئەداتەوە کە نکوڵی لە چەند شتێک دەکەن یەکێک لەوانە بینینی الله تعالى یە لە ڕۆژی قیامەتە.

*#پۆستی : (٨٥)*

## الله تعالى لە هەموو شوێنێک نییە بەڵکو لەسەر عەرشە

زۆر جار وتراوە الله تعالى لە هەموو شوێنێکە یان وتراوە لە هیچ شوێنێک نییە، ئەم قسانە هەندێک جار لەوانەیە بە نەزانی کرابێ بەڵام ئەمانە کوفرن و نابێ موسڵمان بیروباوەڕی ئاوا بێت، بەڵکو ئەبێ پێی وابێت کە الله تعالى لە سەرووی ئاسمانەکانەوە لەسەر عەرشەکەیەتی، تێکەڵی دروستکراوەکانی نابێت و جیایە لەوان.

ئەم بابەتەش بنچینەیەکی ترە لە بنچینەکانی سوننەت و عەقیدەی دروست؛ کە بەڵگە لە قورئان و فەرمووده و وتەی زانایان وە تەنانەت فیطرەتی مرۆڤیش هێندە زۆرن حساب ناکرێن، بەڵام وەکو هەمیشە گومرایان و شەیتانەکانی ناو مرۆڤ ویستویانە دینی الله تعالى لە خەڵکی بشێوێنن و بەرەو جەهەننەم ڕاپێچیان بکەن.

-ئەبو زورعەی ڕازی (٢٦٤ هـ) و ئەبو حاتەمی ڕازی (٢٧٧ هـ) ئیجماعی زانایان نقڵ ئەکەن دەڵێن:

(الله عز و جل لەسەر عەرشەکەیەتی، و جیایە لە دروستکراوەکانی، هەروەکو ئەوەی وەسفی خۆی کردووە لە قورئاندا یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، بە بێ چۆنیەتی)

کتێبی الجامع في عقائد اهل السنة و الأثر : لاپەڕە ٥٢٠

:واتە دان بەوە دەنێی کە الله تعالی لەسەر عەرشەکەیەتی بەڵام بە بێ چۆنیەتی بۆ دانان، چونکە کەس نازانێت الله تعالی و سیفاتەکانی چۆنن، ئەم قسەیەش بۆ هەموو سیفاتەکانی تری الله ڕاستە ڕاستە، دان بە سیفاتەکەی دەنێیت و جێگیری دەکەی بەڵام بە بێ ئەوەی بڵێی چۆنە و چۆن نیە، وە هیچ سیفاتێکی الله تعالی ناشوبهێنرێ بە سیفاتی دروستکراوەکانی.

الله تعالی دەفەرمووێت : ( ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ) (طه : ٥)

واتە : الرحمن بەرز بووەوە لەسەر عەرشەکەی.

هەروەها دەفەرمووێت : (ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ) (الملک : ١٦)

واتە: وا هەست ئەکەن لەو زاتە پارێزراو بن کە لە ئاسمانە وا ناکێشێ بە زەوی و نایلەرزێنێ؟

-موعاویەی کوڕی الحكم السلمي رضي الله عنه وتی :

یا رسول الله، کەنیزەکێکم هەیە زلەیەکم لێدا، پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی لەسەرم بە گەورە دانا، بۆیە وتم: ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: بۆم بهێنە، منیش بۆم هێنا، فەرمووی: الله لە کوێیە؟ کەنیزەکەکە وتی: لە ئاسمانە، فەرمووی: من کێم؟ وتی: تۆ پێغەمبەری الله یت. فەرمووی: ئازادی بکە چونکە ئەو ئیماندارە.

سنن ابي داود : فەرموودەی ژمارە ٣٢٨٢

:ئایا ئەگەر ئەم وەڵامە هەڵە بوایە و ڕاستەکە ئەوە بوایە کە الله تعالی لە هەموو شوێنێکە یان لە هیچ شوێنێک نیە، ئەوا پێغەمبەر ﷺ نەدەهاتە جواب؟ ئایا هەر بە ئیمانداری دادەنا؟ بێگومان نەخێر بەڵکو ڕاستیەکەی فێر دەکرد.

هەروەها ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی:

نێوان ئاسمانی حەوتەم و کورسی پێنج سەدساڵ ڕێ هەیە، وە نێوان کورسی و ئاوەکە پێنج سەد ساڵ ڕێ هەیە، عەرشیش لەسەر ئاوەکەیە، وە الله لەسەر عەرشە، وە ئەو دەزانێ کە ئێوە لەسەر چین.

بڕوانە النقض لدارمي : ئەثەری ٩٣

:ئینجا گومڕا و زەندیقەکانیش وەکو هەمیشە بۆ چەواشەکاری خۆیان چەند ئایەتێکیان بە تێگەشتنی خۆیان تەفسیر کردووە، یەکێک لەوانە :( مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟) (المجادلة : ٧)

واته : هەر سێ کەسێک لەگەڵ یەکتردا چپە بکەن الله چوارەمینیانە وە هەر پێنج کەسێک چپە بکەن، الله شەشەمیانە وە لەو ژمارانەش کەمتر، یان زۆرتر لە هەر کوێدابن هەر الله یان لەگەڵە.

-تابعی بەڕێز ضحاک ی کوڕی مزاحم (١٠٥ هـ) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ :

ئەو لەسەر عەرشە وە عیلمەکەی لەگەڵیانە.

بڕوانە تەفسیری الطبري

-وە عوسمانی کوڕی سعید الدارمي (٢٨٠ هـ) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ :

الله تعالى بەو شێوەیەیە کە وەسفی خۆی کردووە و پێغەمبەر ﷺ وەسفی کردووە کە لەگەڵ هەموو خاوەن چپەیەکدایە، و لە شادەماری ملیان لێیان نزیکترە، بە عیلم و بینین و بیستن لە سەروو عەرشەکەیەوە.

بڕوانە النقض لدارمي : لاپەڕە ١٦٦

:کەواتە ئەم ئایەتە و هاوشێوەکانی کە باس لەوە دەکەن الله تعالى لەگەڵمانە، بە واتای ئەوە دێت کە ئاگای لێمانە و لە سەرووی عەرشەکەیەوە زانیاری بە هەمووان هەیە و هەمووان دەبینێ.

دواتر لە منداڵێکی تازە پێگەشتوو بپرسەبەپرسە الله عز وجل لە کوێیە، یەکسەر دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە خۆ نە قورئان نە فەرموودە نە وتەی سەلەفی نەخوێندووە، بەڵام الله تعالى لەسەر ئەو فیطرەتە دروستی کردووە، ئاخر چۆن دەبێ بڵێی الله عز وجل لە هەموو شوێنێکە؛ دەتوانی بڵێی لە سەرئاو و ناو پیسایی و شوێنە پیسەکانی ترە؟!! پەنا بە الله لەم کوفرانە و پاک و بێگەردی بۆ الله تعالى لەم وەسفانە.

وە ئەوانەش کە دەڵێن لە هیچ شوێنێک نیە؛ مەگەر شتێک ئەسڵەن لە هیچ شوێنێک نەبێ هەر بوونی هەیە؟! جا تێبگەن قسەکانتان بە تەواوەتی ئیلحادە و هیچ جیاوازی نیە.

#پۆستی : (٨٦)

## دەرچوونی کۆمەڵێک لە دۆزەخ

ئایا هەر کەس چووە دۆزەخ لێی نایەتە دەرەوە؟ یاخود تەنها کافرەکان دەچنە دۆزەخ؟

نەخێر؛ الله تعالى بەشێک لە موسڵمانانیش ئەوانەی کە تاوانیان کردووە و تای تەرازووی خراپەکانیان قورسترە لە چاکەکانیان دەخاتە دۆزەخ، ئەووەشمان بیر نەچێ الله عز وجل ویستی لە هەر کەسێک بێت لێی خۆش دەبێ و دەیخاتە بەهەشتەوە بە مەرجێک تەوحیدی هەبووبێ لە دونیادا، واتە ئەمە تەنها بۆ موسڵمانانە، الله تعالى لەوانە خۆش نابێت کە بە کوفرەوە گەڕاونەتەوە بۆ لای .

ئەو موسڵمانانەی کە لە ئاگری دۆزەخدان بە شەفاعەتی شەفاعەتکاران لێی دێنە دەرەوە، وە کافرەکان لەو کاتەدا هیچ کەسیان نیە شەفاعەتیان بۆ بکات و شەفاعەتیشیان بۆ بکەن هیچ سودیان پێ ناگەیەنێت.

- إبن أبي زمنين (٣٩٩ هـ) دەڵێت:

ئەهلی سوننە باوەڕیان هەیە بەوەی الله ﷻ خەڵکانێک لە ئەهلی تەوحید دەخاتەوە بەهەشتەوە دوای ئەوەی ئاگریان بەرکەوتووە، بە ڕەحمەتی خۆی و شەفاعەتی شەفاعەتکاران .

هەر وەکو الله ﷻ فەرموویەتی : ( رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ )(الحجر : ٢)

واتە: بێگومان کافرەکان ئاواتەخوازن کە موسڵمان بوونایە.

وە فەرموویەتی: ( فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ) (المدثر : ٤٨) .

واتە: شەفاعەتی شەفاعەتکاران سودی بۆیان

بڕوانە کتێبی أصول السنة لابن ابي زمنين: باب في الإيمان باخراج قوم من النار

- هەروەها ابن مسعود رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه ئەفەرموویێت :

ئەهلی دۆزەخ بەو کەسانەی کە ئەهلی تەوحیدن و دێنە ناو دۆزەخ دەڵێن: ئەوانە موسڵمانیش بوون، چ سوودێکی پێگەیاندن؟ بۆیە پەروەردگار بۆیان ڕادەوەستێ، دەیانخاتە بەهەشتەوە، لەوکاتەدا: ( يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ) (الحجر : ٢) .

واتە : کافران ئاواتە خوازن موسڵمان بوونایە.

بڕوانە کتێبی أصول السنة لابن ابي زمنين: ئەثەری ١٠٥

: واتە کاتێک کافرەکان بەشێک موسڵمانان دەبینن لەگەڵیانن لە دۆزەخدا دەڵێن ئەوان موسڵمانیش بوون کەچی لەگەڵ ئێمە لە دۆزەخن، کەواتە دینەکەیان هیچ سوودی پێیان نەگەیاندن، لەو کاتەدا الله تعالی موسڵمانانی دۆزەخ دەردەهێنێ بۆیە کافرەکانیش ئاوات دەخوازن کە موسڵمان بوونایە.

- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت :

(پردی صیراط لەسەر پشتی جەهەننەم دادەنرێ، دڕکێکی پێوەیە وەکو دڕکی ڕووەکی السعدان وایە - السعدان جۆرە ڕووەکێکە لە بیابانەکان دەڕوێ والله اعلم - ، پاشان خەڵکی بەسەریدا دەڕۆن، جا تێیدایە ڕزگاری دەبێ و سەلامەت دەبێ، وە تێیدایە دەڕوشێت، وە تێیدایە دڕکەکە لێی گیر دەبێ و دەیخاتە ناو ئاگرەکەوە، جا کە الله تەواو بوو لە دادوەری لەسەر بەندەکان، ئیمانداران بیری پیاوانێک دەکەن کە لە دونیادا لەگەڵیان بوون، وەکو ئەوان نوێژیان دەکرد و زەکاتیان دەدا و ڕۆژوویان دەگرت و حەجیان دەکرد وە لەگەڵیاندا غەزایان دەکرد، بۆیە دەڵێن : پەروەردگارا؛ چەند بەندەیەک لە بەندەکانت لە دونیادا لەگەڵمان بوون، وەکو ئێمە نوێژیان دەکرد و زەکاتیان دەدا و ڕۆژوویان دەگرت و لەگەڵمان غەزایان دەکرد، نایانبینین؟).

فەرمووی: (الله پێیان دەفەرموێ: بڕۆنە ناو ئاگر جا هەر کەستان تێیدا دۆزیەوە دەری بهێنن).

فەرمووی: (ئەوانیش دەیان بینن کە بە پێی کردەوەکانیان ئاگر گرتونی، تێیدایە کە ئاگر تا پێیەکانی گرتویەتی، وە تێیدایە ئاگر تا نیوەی قاچەکانی گرتویەتی، وە تێیدایە هەتاکو ئەژنۆکانی، وە تێیدایە

**هەتاکو کەمەری، وە تێیدایە هەتاکو سینگی، وە تێیدایە هەتاکو گەردنی گرتویەتی و ڕووخساری نەگرتۆتەوە) .**

**فەرمووی: (ئینجا دەریان دەهێنن و دەیان خەنە ناو ئاوی ژیانەوە) .**

**وترا: ئەی پێغەمبەری الله ﷺ ئاوی ژیان چیە؟**

**فەرمووی: (غوسڵی ئەهلی بەهەشتە، دواتر دەڕوێن هەروەکو چۆن تۆو دەڕوێ کە هەڵگیراوە لە ناو قوڕ و پوشدا، پاشان پێغەمبەران شەفاعەت دەکەن بۆ هەر کەس کە بە نیەت پاکیەوە شاهێدی دابێت بە لا إله إلا الله، دواتر دەریان دەهێنن).**

**فەرمووی: (پاشان الله ڕەحم دەکا بەوانەی کە تێیدان، بۆیە هیچ بەندەیەکی تێدا ناهێڵێتەوە کە مسقاڵە زەڕڕەیەک ئیمان لە دڵیدا بێت، ئیللا دەری دەهێنێ).**

**بڕوانە مسند الإمام أحمد: ١٤١ و ١٤٣ .**

**#پۆستی : (٨٧)**